نەوشیروان مستەفا

# گۆڕان

## لەکوێوە گەیشتە کوێ؟

ەند گفتوگۆیەکی ڕۆژنامەوانی" ٢٠٠٦ - ٢٠٠٩

نەوشیروان مستەفا

# گۆڕان
# لەکوێوە گەیشتە کوێ

«چەند گفتوگۆیەکی رۆژنامەوانی»

٢٠٠٦ - ٢٠٠٩

# پێرست

**بابەتەکان** **لاپەڕە**

(ژماره ۳۹۱۲ ی رۆژی یەکشەمە ٥ی ۳ی کوردستانی نوێ:۲۰۰٦)

# گفتوگۆی رۆژنامەوانی:

# لە گەڵ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان

بەهرۆز عەلی، بە بۆنەیساڵیادی راپەڕینەوە کۆڕێکی بۆ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان ئامادە کرد. ئەوانەی لە کۆڕەکەدا بەشدار بون:

نەوشیروان مستەفا

عیماد ئەحمەد، جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران (ئیدارەی سلێمانی)

کاوە محەمەد، سەرنوسەری رۆژنامەی کوردستانی نوێ

لاوەند نەوزاد، نوسەر لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ

سەردار عەبدوڵا، نوسەر

عارف قوربانی، بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی کەرکوک

گفتوگۆکانی کۆڕەکە لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان (PUKTV) دا بڵاو کرایەوە. رۆژنامەی کوردستانی نوێ بە زنجیرە لە ژمارەکانی ۳۹۱۲ – ۳۹۱۷ رۆژانی ٥ – ۱۰ ی ۳ ی ۲۰۰٦ .. دا دەقی گفتوگۆکەی بڵاو کردەوە. ئەوەی لێرەدا بڵاو ئەکرێتەوە، وەکو خۆی، لە کوردستانی نوێ راگوێزراوە.

# له گەڵ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان

**بەهرۆز عەلی: راپەرین، چی بۆ کردوین و دەبێت چیتر بکەین؟**

لەساڵیادی راپەرینی خەڵکی کوردستاندا تەلەفریۆنی گەلی کوردستان بەرنامەیەکی تایبەتی بۆ هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی ئەو روداوە گەورەو گرنگەی خەڵکی کوردستان بەبەشداری سیاسەتمەدارو رۆژنامەنوسان (نەوشیروان مستەفا، عیماد ئەحمەد، کاوە محەمەد، سەردارعەبدوڵڵا، عارف قوربانی، لاوەند نەوزاد) ئامادەکردوە، لەبەر گرنگی بابەت و تەوەرەکانی ئەو بەرنامەیەو بیروبۆچونەکان کوردستانی نوێ بەچەند ئەڵقەیەك بڵاوی دەکاتەوە کە بەرنامەکە لەلایەن رۆژنامەنوس بەهرۆز عەلی‌یەوە ئامادەکراوە.

**بەهرۆز عەلی: سەرەتا تەوەری یەکەم وەک پرسیار ئاراستە دەکەین و پاشان گفتوگۆی لە سەر دەکەین، پرسیارەکەش ئەوەیە ئێستا ١٥ ساڵ بەسەر راپەڕیندا تێپەڕبوە، ئایا لە چ ئاستێکدا سەرکردایەتی سیاسیی کوردستان نەیتوانیوە بەباشی ئەدای سیاسیی خۆی بکات، چ لە سەر ئاستی سیاسی و چ لە سەر سیستمی حوکمڕانی لە کوردستاندا؟**

نەوشیروان مستەفا: رەنگە ئەگەر ئەو پرسیارە لەیەکێك بکەن کەلەدەرەوەی سەرکردایەتی سیاسیی کوردستاندا بێت باشترە، چونکە بەدرێژایی ١٥ ساڵی رابردو پێش ئەوەش من خۆم بەشێك بوم لە سەرکردایەتی سیاسی، وەختێك تۆ خۆت لەناو پارییەکەدا بیت کەموکوڕییەکانی خۆت زۆر بەچاکی نابینیت وەکو ئەو کەسەی کە لە دەرەوەی پارییەکە تەماشا دەکات، بۆیە ئەگەر ئەو پرسیارەت ئاراستەی یەکێکی تر بکردایە زۆر باشتر بو.

سەردار عەبدوڵڵا: سەرکردایەتی سیاسی لە هەرقۆناغێکدا لە هەندێك دۆسێدا رەنگە ئەدائی باش بێت، لە هەندێك حاڵەتیشدا رەنگە تێبینی لە سەر بێت، لە هەندێکیشیدا ئەدائی خراپ بێت، واتا هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی کاری سیاسی، سەرکردایەتییەك دەستکەوت بە دەست دەهێنێت و هەڵەش دەکات، بەڵام سەرەنجام ئەگەر قسە لە سەر رەوشی کوردستان بکەین، سەرکردایەتی سیاسیی کوردستان هەردوکی کردوە، ناتوانین شانازیی ئەوەیان

لێ بسێنینەوە کە بەدەستیان هێناوە، سەرکردایەتی راپەڕینییان کردوە، دواتریش لە قۆناغە سەختەکاندا سەرکردایەتییان کردوە، هاوکاتیش نابێت بێبەری بکرێن لەو هەمو رەخنەیەی کە روبەڕویان دەکرێتەوە، لە هەندێك شوێندا ئەدائیان باش بوە، لە هەندێك شوێندا تێبینی لە سەرە، لە هەندێك شوێندا زۆر خراپ بوە.

لە سەردەمی بەرەی کوردستانیدا لە شێوازی کاری حوکمڕانیدا ئەدائی باش نەبوە، ئەگەر بەتایبەتی قسە بکەین رەنگە قۆناغەکە قۆناغێکی پشێوی بوبێت، بەڵام ئەو پشێوییەی کەتێیدا بەرەی کوردستانی دامەزرا، واتا ئەگەر خودی پشێوییەکەش نەگوازرابێتەوە ئەوا رەفتاری پشێوییەکەو پێکهاتەکەی و ئەخلاقیاتی حوکمی بەرەی کوردستانی گوازرایەوە بۆ سەردەمی دوای دامەزراندنی حکومەت و هەڵبژاردن. بۆ نمونە پێش راپەڕین دابەشکردنی مەسەلەکان لەنێوان حیزبەکاندا بو، بەپێی رێژەیەك بو کەتایبەت بو بەقۆناغی شاخ، پاش راپەڕین و هەڵبژاردن پێوەرێکی تر لەجۆری دەسەڵات هاتەکایەوە. هەڵە لەوەدا کرا کەئێمە هەر لە سەرەتادا نەمانتوانی کار بۆسیستمێکی دامەزراوەیی بکەین کەپێوەرەکانی یاساو بەڕێوەبردنی دەوڵەت ئەولەویەتی سەرەکیمان بن و ملکەچی ئەو رێککەوتنانە بون کە لە نێوان ئەولایەنانەی لە هەڵبژاردندا توانیان دەنگ بە دەستبهێنن ئەمەش وایکرد کە هەر لە سەرەتاوە نەمانتوانی سیستمێکی باش دابمەزرێنین، ئەمەش دواتر گواسترایەوە بوە هۆی ئەوەی کە شەڕی ناوخۆی لێ بکەوێتەوە. لە ماوەی قۆناغی شەڕی ناوخۆدا ئەدائی سەرکردایەتی سیاسیی کوردستان ئەوەندە خراپ بوە کە هەندێك جار کارەساتی گەورەی لێ کەوتوتەوە.

ئەگەر قسە لەدەستکەوتیش بکەین سەرکردایەتی سیاسیی کوردستان توانیویەتی بەتایبەتی لەدوای کارەساتی ١١ ی سێپتەمبەرەوە خوێندنەوەی وردی بۆ پێشهاتەکان هەبێت، توانیویەتی لەناو ئەو ململانێ جیهانییە گەورەیەی کەهەیە، لەگەڵ ئەوەی کە لەناوخۆیدا قسەوباس هەبوەو رای جیاوازیش هەبوە، کە ئەوە دیاردەیەکی تەندروستە، بەڵام توانیویەتی لە پاڵ ئەوانەداو لە هەندێك قۆناغی سەرەکیدا باش لەگەڵ ئەوەدا بڕوات.

کاوە محەمەد سەرنوسەری کوردستانی نوێ: ئەگەر ئێمە

بەڕاستی پێناسەی ئەرکەکانی ڕاپەڕین بکەین، ناتوانین تەنیا لە مەسەلە سیاسییەکەدا وردی بکەینەوەو لە هەمو ئاستەکانی دیکەدا زیاتر سەرەنجام و ئەنجامەکانی ئەو سەرکەوتن و دەستکەوتانە دەردەکەوێت کە هاتونەتە دی. چ لە سەر ئاستی کوردستان، چ لە سەر ئاستی عیراق، ڕاستە لە ئەرکەکانی ڕاپەڕین مەسەلە سیاسییەکە ئەولەوییەت و گرنگی سەرەکی هەبو، لە هەمان کاتدا ئەرکی ڕاپەڕین ئەوەبو تەنها ئەوە نەبێت کە دەسەڵاتی سەدام حسێن و دیکتاتۆریی ڕژێمی بەعس لە کوردستاندا نەمێنێت و دەسەڵاتێکی کوردستانی بێتە پێشەوە، دەبێت قسە لە سەر ئەوەش بکەین کە ئەو دەسەڵاتە کوردستانییە چۆن بێت؟ ئایا دەسەڵاتی حکومەت و حیزبەکان لە کوردستان توانیویەتی ئەرکەکانی ڕاپەڕین بەدیبهێنێت؟ پێم وایە ڕێژەیەك لەدەستکەوت و ئەرکەکان بەدیهاتون و ڕێژەیەکی زۆریش بەدینەهاتوەو پێویستە کاری لە سەر بکەین. ئەگەر باس لە ئاستە کۆمەڵایەتییەکە بکەین یان باس لە ئاستە ئابوری و ئاستەکانی دیکە بکەین، ئەوە قسەی زۆر هەڵدەگرێت کە بەڵێ پێویستە ئیشی زیاتر بکرێت. یەکێك لەخاڵە هەرە سەرەکییەکان بۆ بەدینەهاتنی ئەو ئەرکانەش بە بۆچونی خۆم بۆ ئەوەی دەگەڕێنمەوە کە مەسەلەی دروستنەکردنی سیستمی دامەزراوەیی و ئیشنەکردن بەعەقڵیەتی دامەزراوەیی بوە، بەداخەوە ئێستاش دەبینم هەندێك بیرکردنەوە چ لەناو حیزب و چ لەناو حکومەت لە ئاستی ئەم قۆناغەو ئەم سەردەمەدا نییە، لە ئاستی داواکاریی و خواستەکانی خەڵکی کوردستاندا نییە. بۆیە ئەگەر بێمە سەر وردەکاری، ئەوا دەتوانم بڵێم ڕێژەیەکی زۆر بەدینەهاتوە.

**بەهرۆز عەلی: کاک کاوەو کاک سەردار ئاماژەیان بەهەندێک کێشەو کەموکوڕی کرد کەدەرەنجامی دوای ڕاپەڕین بون، پرسیارەکە ئەوەیە کەئایا وەک دەوترێت شۆڕش دەگاتە قۆناغی پاش ڕزگاریخوازی دوچاری کۆمەڵێک قەیران دەبێتەوەو کۆمەڵێک قۆناغ هەیە دەبێت تێیانپەڕێنێت، ئایا لەماوەی ١٥ ساڵدا توانیومانە ئەوقۆناغانە تێپەڕێنین؟**

نەوشیروان مستەفا: ئەو قۆناغانە لەتەمەنی میللەتاندا هەندێکجار بەماوەیەکی کەم دانامەزرێت، ئێمە لەدوای ڕاپەڕینەوە تائێستا ڕاستە ١٥ ساڵە، ئیتر بۆمان نییە باسی ئەزمونی

ساوا بکەین، ئەزمونەکەمان پیر بوە، بەڵام ئەوەی برادەران باسیان کرد لەراستیدا ئەوە یەکێك لە هەرە کەموکوڕییەکانە کە پێمانەوە دیارە، ئەویش ئەوەیە کە نەمانتوانیوە تا ئێستا دەوڵەتی موئەسەسات دروست بکەین بەو واتایەی هەر دەزگایەك دەسەڵاتەکانی خۆی لە ڕوی یاساییەوە دیاری کرابێت، بزانین چییەو چی نییە، گەورەترین کاری سەرنەکەوتوشمان شەڕی ناوخۆ بوە کە هاتە پێشەوە من پێم وایە، هەندێك شتکراوەو هەندێکیش نەکراوە، بەتایبەتی لە روی سیاسییەوە شتی زۆر کراوە، لە روی سیاسییەوە بۆیەکەمجار توانیومانە ئەزمونێکی نوێ لە کوردستانی عیراقدا دابمەزرێنین، حکومەت دابمەزرێنین، پەرلەمانمان هەبێت هەرچەندە پەرلەمانەکەمان کارا نییە، بەڵام دامودەزگای ئاسایش دابمەزرێنین، دامودەزگای دەوڵەت دابمەزرێنین و لە سفرەوە ئێمە دەستمان پێکردوەتەوە، وڵاتێکی وێران کە هەمو دێهاتەکانی وێران بو، وڵاتێك کە هەموی بێ ئیش بو، بانقەکانی هەموی خاڵی بو، هیچ دەرامەتێکی وامان لە بەردەستدا نەبو، حکومەتێك دروستکراوەو ئەو حکومەتە توانیویەتی وەکو نمونەیەك جێگەی ئومێدی هەمو خەڵکی کوردستان و نەك هەر لە کوردستانی عیراقدا، بەڵکو لە هەمو شوێنەکانی تریشدا، لە روی زامنکردنی ئازادیشەوە، من ناڵێم ئازادییەکی نمونەییە، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ دەورو پشتەکەماندا، پێم وایە لەچاو عیراق و ناوچەکەدا جۆرێك لە ژیانی دیموکراسی هاتوەتە پێشەوە کە بۆ هەمومان جێگای سەربەرزییە.

جگە لەوە ئێمە تا ئێستا نەمانتوانیوە دەوڵەتی دامەزراوەیی دروستبکەین، لە هەمان کاتدا گەندەڵی لەدامودەزگاکانی ئێمەدا چۆن گانگرین لە لەشی نەخۆشدا لە قاچەوە دەستپێدەکات و هەمو لەشی دەگرێتەوە لە بەر ئەوەی لە کاتی خۆیدا بە ڕێکوپێکی ئەو دەوڵەتی موئەسەساتانەمان نەبوە کە بتوانێت لێپرسینەوە لەگەڵ هەمو ئەوانەدا بکات کە کەموکوڕیی و عەیبی تیایە، ئەوا ئەو گانگرینە هەمو لەشی گرتوەتەوەو بوەتە گەورەترین عەیب ئێستا لە کوردستانی عیراقدا.

گۆران لە کۆبوە گەیشتە کوێ .....

**بەهرۆز عەلی: لەچ ئاستێکدا بوە کە دەبو چارەسەربکرێت و چارەسەر نەکراوە؟**

نەوشیروان مستەفا: خۆی هەمو شتێك دەبێت ببرێتەوە زەمان

کەموکوڕیەکی هەڕە ٥١ هەڕە ٥١

و زەمینی خۆی، ئێمە لەپاش ساڵی ۱۹۹۱ەوە لە حاڵەتێکدا بوین، ئابلۆقەیەکی جیهانی لە سەر عیراق بو، ئێمەش بەشێك بوین لەعیراق، ئابلۆقەیەکی دیکەی ناوچەکەشمان لە سەربو، لەناوخۆشماندا بو بەشەڕی ناوخۆ، بە وەزعێکی نائاساییدا تێپەڕین، مونافەسەیەکی چەکدار لەنێوان هێزە سیاسییەکانی ناو کوردستانی عیراقدا هەبو کە هەرکەس هەوڵی دەدا زۆرترین خەڵك لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە بە رەفتاری جیاجیاو ناڕێك و نادیموکراسی، کە دەبیەیتەوە سەر زەمان و زەمینی خۆی کۆمەڵێك هۆ هەبوە بۆ ئەوەی کەتۆ نەتوانی ئەوەی کە پێویستە بیکەی، پاشان ئێمە خۆشمان ئەزمونمان نەبوە کۆمەڵێك بوین لە خەباتی ژێر زەمینی و شاخەوەو لە روخاندنی دەوڵەتەوە دەستمان پێکردوە، ئێمە لەو کەسانە نەبوین کە بەشێك بوبین لە دەوڵەت و دەوڵەت بگۆڕین، بەڵکو کۆمەڵێك بوین ویستومانە دەوڵەت و حکومەت بروخێنین و حکومەت و دەوڵەتێکی نوێ دروست بکەین، تا ئەوەی کەزانیومانە کردومانە.

**بەهرۆز عەلی: ئەوەی کەموکین بوە بکرێت و نەکراوە دەتوانیت ئاماژەی پێبدەیت؟**

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئێمە دەمانتوانی پەرلەمانێکی کارامان هەبێت، تائێستا نیمانە، دەمانتوانی یاسا سەروەربێت، بەلام یاسا سەروەر نییە، چونکە تائێستا ژمارەیەکی زۆر لەکاربەدەستەکانی حکومەتیش و حیزبیش بەشێوەیەکی نامەشروع دەوڵەمەندبون و هیچ کەسێك ناتوانێت لێیان بپرسێت بڵێت ئەم پارەیەت لەکوێ هێناوە، بۆ نمونە خزم خزمێنەو حیزب حیزبێنەو ... هتد واستەو واستەکاری نەك هەر لەناو دامودەزگاکانی حکومەتدا، بەڵکو لەناو حیزب و پێشمەرگەشدا هەیەو کەس ناتوانێت لێیان بپرسێتەوە. ئەگەر دادگا هەبوایەو شوێنێکی لێپرسینەوە هەبوایە چ لەناو حکومەت و چ لەناو دامودەزگاکانی حیزبدا، بێگومان بەوە نەدەگەیشت، ئەوە یەکێکە لەکەموکوڕییە گەورەکان کە پێویستە چارەسەر بکرێت.

**بەهرۆز عەلی: کاک عیماد، کاک نەوشیروان باسی ئەو کەموکوڕییانەی کرد، بەڕێزتان وەک ئەندامی مەکتەبی سیاسی و وەک ئەوەی ماوەیەکی زۆریش لە پۆستی ئیداریدا وەک وەزیرو ئەم ماوەیەش کە جێگری**

**سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستانن، دەتوانین ئەو کەموکوڕییانەی کە باسکران لە ئیدارەدا کە مومکین بو چارەسەربکرێن، تا چەند هەوڵتان داوە چارەسەربکرێن یان بۆتان کۆنترۆڵ نەکراوە؟**

عیماد ئەحمەد: بێگومان وەکو ئیدارە جگە لەو هۆکارانەی کە کاک نەوشیروان و ئەو برادەرانەی تر باسیان کرد، وەك شەڕی ناوخۆو نەبونی دامەزراوەی کۆمەڵگەی مەدەنی و دیموکراسی، پاشماوەی بەعسیشمان بۆ مایەوە، یەکێك لەگیروگرفتەکانی ئێمە کە لەدوای راپەڕینەوە هاتوینەتەوە سەر وڵاتێکی کاول، هاتوینەتە سەر وڵاتێك کەشوێنەواری سیاسەتی بەعس لەناو کۆمەڵگەکەماندا هەبوە، باش بو ئێمە وەکو ئەزمونەکەی عیراق لەدوای روخاندنی رژێمی بەعس کەئێستا حاڵی بەغداو باشورو ناوەڕاست دەبینین توشی چ دەردەسەرییەك بون، ئێمە لای خۆمان پێش راپەڕین (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان)، وەك کاك نەوشیروان رایگەیاند کەبۆخۆی یەکێك بوە لەکاراترین سەرکردەکانی یەکێتی بۆ راپەڕین ئەو کێشەیە چارەسەرکرا، کەئێمە چۆن پاشماوەی رژێمی بەعس لەکۆمەڵگەکەمان پاکبکەینەوە، وەکو تاکەکەس و وەکو دیاردەش پاشماوەی بەعس لەپەروەردەو لەخەڵك پاکبکەینەوە. ئێمە چەند دەیان هەزار جاشمان هەبوە، وەکو کەس، وەکو دیاردەش حیزبی بەعس وەکو حیزبێکی شمولی کاریکردوە لە کوردستانیش تەراتێنی کردوە، بەڵام کاریگەریی وەکو بەغدا نەبوە، چونکە لەوکاتەدا رژێم بەسەر هەرماوە، بەڵکو ئەوکاتە رژێم ئیدارەی کێشایەوە، ئێمە هاتینە سەرئەوەی کەسەرلەنوێ ئیدارەیەکی تر دروستبکەین، ئەوەبو هەڵبژاردن کرا، پەرلەمان دامەزرا، حکومەت پێکهێنرا، ئەوەی کەمومکین بوە کەبکرێت بەڕاستی ئەوەی کەنەکراوە موئەسەساتی حکومییەکەمان موئەسەساتێکی رەگ داکوتاو نەبوە، هەمو شتەکان بونەتە فەوقی و تاکرەوی و جا چ سەرۆك وەزیر یان وەزیر، ئێستا تێکەڵاوییەك هەیە لەنێوان حیزب و حکومەت ئەوەش یەکێکە لەگرفتەکان، کەدەسەڵاتی حیزبە کەرۆڵی خۆی هەیە لە هەڵبژاردندا لەگەڵ دەسەڵاتی حکومەت، بەراستی ئێمە تائێستا وەکو شتێکی زانستی و لۆژیکی جیامان نەکردوەتەوە ئەوەش یەکێك لە گرفتەکانە کە زۆرجار لە شوێنێك لە دامودەزگایەك حیزب ئەوەندە دەسەڵاتی بەسەر دامودەزگاکانی حکومەتەوە هەیە، حکومەت ئەوەندەی نییە، ئێمە زۆرجاریش

بەشکڵ دەڵێین ئەو دو دەسەڵاتە جیان، بەڵام ئەو تێکەڵاوییە هەیە، جا بۆئەوەی کەئێمە لەمەودوا سەیری ٦٠ساڵەی رابردوی خۆمان بکەین هەر ١٥ساڵ بۆ ١٥ساڵ شتێك دروست بوە، بۆنمونە لە ساڵی ١٩٤٦ دا پارتی دروست بوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٦١ دا شۆڕش بەرپا بوە، پاشان لەساڵی ١٩٧٦ شۆڕشی نوێ دروستبوە، پاشان لەساڵی ١٩٩١ راپەڕین بەرپا بوە، واتا پاش ١٥ ساڵ، لە ١٩٩١ یشەوە تائێستا ئەوە ١٥ ساڵە، کەواتە ئێمە ئەم ١٥ ساڵە لەزەمەن کە هاتوە بەرامبەر ئەوکارانە ئەگەر وەرچەرخانێك نەکەین، ئەوا پێم وایە ئەمەی کەهەمانە بەرەو ئاقارێکی خراپ دەڕوات، واتە حاڵەتێك دروستبوە خانەخانە ١٥ ساڵ، ١٥ ساڵ ئەم ١٥ ساڵەی ئێستامان وەك یەکێتی، وەك گەلی کورد، وەك حکومەت، دەبێت خۆی بگەیەنێتە قۆناغێکی ترو وەرچەرخانێکی تر، جائیتر ناوی دەنێی گەندەڵی دەسەڵاتی حیزب و حکومەت، نەبونی موئەسەساتی دیموکراسی و حکومی، ناودەنێیت دەبێت ئێمە ئەمە پاك بکەینەوەو بچینە قۆناغێکی تر.

**بەهرۆز عەلی: باسی ئەوەکرا کە تا چەند توانیومانە دیاردەی بەعسیزم لەناو بەرین یان لێی دەربازبین؟**

عارف قوربانی: بەبڕوای من ئەگەر بەعس وەکو کلتورێك سەیر بکەین لە وڵاتەکەدا، بەداخەوە نەك ئێمە هەمو هێزە سیاسییەکانی کوردستانیش نەیانتوانیوە خۆیان لەو کلتورە رزگاربکەن. کەبەعس پەیڕەوی کردوە چ لە ژیانی سیاسی و چ لە ژیانی کۆمەڵایەتی، چ لە ژیانی ئیداریشدا. زۆر چاولێکردن و دوبارەکردنەوەی ئەو کلتورە هەبوە لە دەسەڵات و حوکمڕانیی کوردستاندا چ لەم هەرێمە چ لە هەرێمی ئەولا، دەمویست قسە لە سەر ئەوە بکەم ئەم ١٥ ساڵەی دوای راپەڕین ئەگەر بکرێت ١٥ ساڵی دوای راپەڕین بەنمونە وەربگرین، کەبۆ ئێمە ئەزمونێکی نوێیە، پێویستە لێرەدا قۆناغ بەندییەك دروستبکەین کەسەرەتای ئەم قۆناغە نوێیەی ئێمە حکومەتەکەمان، دەسەڵاتەکەمان لەقەیراندا ژیاوە، بەڵام خۆئەوە ٣-٤ ساڵە لەقەیرانەکان رزگاری بوە، پێویستە قۆناغی پێش روخاندنی سەدام و پاش روخاندنی بکەین بەدو قۆناغی جیا بۆ بزوتنەوەی رزگاریی کوردستان، کاتێك حکومەتی ئێمە ساوایە ئەوکاتە توشی قەیرانی ئابلۆقەی ئابوری دەبێت، توشی شەڕی ناوخۆ دەبێت، هەمو ئەو وەزعە

سیاسییە نالەبارەی کەهەبو لە کوردستاندا، ئەوکاتە ئەداتی سیاسی ئێمە باشتربو، ئەدای حوکمڕانیکردنمان باشتربو لەدوای روخاندنی رژێمی سەدام، چونکە ئێستا لەڕوی داهات و داراییەوە حکومەتەکەمان باشترەو دەوڵەمەندترە، حیزبەکانمان فراوانترن، ناوچەکەمان فراوانترە، دەسەڵاتەکانمان بەشوێنی دیکە دەگات، کادری زیاتر هاتونەتە ریزەکانمانەوە، واتا هەرچۆنێك بەراوردی بکەین و ئەوەی کەجێی هەڵوێستەیەو من بەمەترسیی دەزانم ئەوەیە کەحکومەتەکەمان چەند ساڵی زیاتر چوەتە سەر تەمەنی، دەسەڵات و ئەزمونەکەمان بەرەو قەیراناوی ترو بەرەو خراپترمان بردوە.

عارف قوربانی: ئەگەر باری ئێستا لەگەڵ پێش روخاندنی سەدام بەراورد بکەین ئەوا رەنگە ئەدائی ئیشکردنمان لەڕوی سیاسی و ئیدارییەوە باشتر بوبێت لەدوای روخاندنی کەوا سێ ساڵی تریش چوە سەری، ئەوکاتە توانای دارایی حکومەتی ئێمە کەمتر بوە، ئەدائی حکومەت بۆ ئاوەدانکردنەوەو ژێرخانی ئابوری وڵاتەکە باشتر بوە لەوەی کەئێستا بودجەو ئابورییەکی بەرفراوان لەدەست دەسەڵاتدایە، ئەگەر بەتایبەتیش دەستنیشانی ئەوە بکەین کەچی بکرێت و نەیتوانیوە بیکات وەك ئەم بەرێزانە ئاماژەیان پێدا، لەوماوەیەدا حکومەت دەیتوانی لەماوەی ئەو ١٥ ساڵەدا هیچ نەبێت هەندێك چوارچێوەی یاسایی بۆ ژیانی حوکمڕانیکردنی خۆمان دابنێت کەنەکراوەو خاڵێکی تریش کەدەکرا بکرێت و نەکراوە مەسەلەی پەروەردەیە، ئێستا لە وڵاتی ئێمەدا کە ١٥ ساڵەو نەوەیەك پەروەردە دەبێت، ئەگەر بێت و پێوەرێك دابنێیت، کامەیە کەپەروەردە یان نەوەی شۆڕشن؟ ئێمە ئەدای پەروەردەکردنمان چۆن بوە؟

ئەو نەوەیە ئەگەر ئێستا بەراوردبکەین، نەشمانتوانیوە بەشێوەیەکی سروشتی میکانیزمێك بدۆزینەوە بۆئەوەی کەنوێبونەوەیەك لە وڵاتی ئێمەدا هەبێت.

ئەو لێشاوە خەڵکەی کە هاتونەتە ناو ریزی هێزە سیاسییەکانەوە یان ناو حکومەتەوە.

لاوەند نەوزاد: کلتورەکە هی بەعس خۆی نییە، سیستمێکی شمولییە، سیستمێکی دیکتاتۆرییە، سەرەوە زۆر گرنگە، خوارەوە هیچ نییە، ئێمە ئەوەمان پەیڕەوکردوە، ئەمە تەنیا هی بەعس نییە، ئەمە لەزۆر وڵاتی ناوچەکە پەیڕەوی لێدەکرێت، بۆنمونە

کلتوری بەعس رەنگە کاریگەریی لە سەر کەسێکی تەمەن (٤٥-٥٠) ساڵان هەبێت، ئەی ئەوکەسەی کە لەکاتی راپەڕیندا تەمەنی (٥) ساڵ بوە، بۆچی ئێستا بەهەمان شێوە وەك ئەوە وایە لەژێر کاریگەریی کلتوری بەعسدایە، چونکە ئەوەی لەدوای بەعسیش هاتوە، نەیانتوانیوە دژایەتی کلتوری بەعس بکات و لەهەندێك رەفتاردا وەکو کلتوری بەعسی کردوە، گەرچی لەکوشتوبڕدا وانەبوە، بەڵام وەزیر گرنگە نەك وەزارەت، سەرۆکی حکومەت گرنگە، نەك حکومەت یان بەڕێوەبەر نەك بەڕێوەبەرایەتیەکە، گەرچی کاتێك وەزیر دەڕوات وەزارەتەکە لەشوێنی خۆیەتی، بەڵام لای ئێمە وانەبوە، زۆربەی ئەو برادەرانەی باسی گۆڕان و پێشکەوتن دەکەن، خۆیان نایانەوێت بیکەن، چۆن چاکسازی دەدەیتە دەست کەسێك کەخۆی نایەوێت چاکسازیی روبدات، یان شتێکی خراپ دەدەیتە دەست یەکێك کەچاکی بکاتەوە لەکاتێکدا کەچاککردنەوەکە لەزیانی ئەودا بێت؟ ئەوانە هەمو گرفتن، بەڵام تاچەند ویستومانە چاکی بکەین؟ پێم وایە نەمانوسیتوە، بەپێچەوانەوە زۆرجار سەرکردایەتی وایکردوە خەڵکی خوارەوە بەهەمان شێوەی ئەو بیربکاتەوە، ئێستا بوە بەکۆمپانیا، کۆمپانیا، نەك هەرئەوان خەڵکی دیکەش سودی لەوەدایە ئەم رەوشە وەکو خۆی بمێنێتەوە، واتا ناهێڵێت ئەم رەوشە بگۆڕدرێت.

ئێمە دەڵێین چاکسازی، گۆڕان، میکانیزممان چییە؟ چۆن دەکرێت؟ بەکێ دەکرێت؟ باسی ئەو مەلامحانە ناکەین، بەڵام قەزاو دەزگای دادوەریی لە کوردستاندا سەربەخۆ نییە! کەواتە چۆن دەکرێت؟ هەیئەی نەزاهە لەبەغدا هەیە، بەڵام لای ئێمە نییە، کۆمسیۆنی نەزاهە یەکێکە لەدەزگا گرنگەکان، قەیناکە ئەوەی لەعیراقدایە لەژێر کۆنترۆڵی حکومەتی ناوەندیدایەو بەسیاسی بوەو بیانەوێت کێشە بۆ هەر کەسێك دروستبکەن لەڕێی کۆمسیۆنی نەزاهەوە گرفتی بۆ دروستدەکەن، بەڵام گرنگ ئەوەیە میکانیزمەکە هەیە، ئەمڕۆ وایە سبەی وانابێت، بەڵام ئێمە کێ بڕیار دەدات کەفلانە کەس گەندەڵە، فلانە کەس بێگەردو چاکە، کەس نازانێت، ئەمڕۆ تۆ بڕیار دەدەیت، سبەینێ من بڕیار دەدەم ئەمانە هەمو کێشەکانمانن.

**بەهرۆز عەلی: دەربارەی ئەوکێشەو کەموکوڕییانەی کە بەبەردەوامی هەن و لەگەڵ ئەوەشدا هاوکێشەیەک هەیە کەزۆر دەوترێت ئێمە مادام**

**ئێستا لەبەردەم مەترسییەکی گەورەتردایین، ئەویش کەمەترسیی دەرەکییە، هەمیشە ئەو هاوکێشەیە یان ئەو رستەیە لە سەر حسابی کێشەو گرفتەکانی ناوخۆ بوە، واتا مادام نەگەیشتوینەتە قۆناغی رزگاریی ئەوەی کەپەیوەندی بەچارەنوسی میللەتەکەمانەوە هەیە، چاوپۆشیمان لەکۆمەڵێک کەموکوڕی ناوخۆ کردوە، جا چ لە سەر ئاستی سیاسیی بوبێت یان لە سەر ئاستی ئیداری، کاک نەوشیروان بەڕای بەڕێزت ئەو پاساوە تاچەند پاساوێکی واقیعیە؟ ئەگەر پاساوێکی واقیعی بێت بۆ لەمەودوا تاچەند بڕدەکات؟**

- نەوشیروان مستەفا: ئەوە ئەگەر لە سەردەمی پێش روخاندنی سەدامدا شتێکی راست بوبێت، ئەوا ئێستا هیچ پاساوێکی نەماوە، ئێستا هیچ مەترسییەکی دەرەکیمان لە سەر نییە، لە سەردەمی سەدامدا ئەگەر مەترسیمان لە سەر بوبێت، ئێستا ئەو مەترسییەمان لە سەر نەماوە، دەتوانم نمونەیەك بهێنمەوە لە سەر فەلەستینییەکان و ئیسرائیلییەکان، هەمو جارێك فەلەستینییەکان کەمەسەلەی ریفۆرم و چاکسازی و هەڵبژاردن و گۆڕینی سیاسی و دەستاودەستکردنی سیاسیی دەسەلات دەهاتە پێشەوە، دەیانوت: ئەوە مەترسیی ئیسرائیل هەیە، لەبەرئەوە با نەیکەین، تا گەندەڵیی وایلێکردن کەرێکخراوێکی شۆرشگێڕی وەکو فەتح کە سەردەمێك رەمزی شۆرش بو لە سەرتاسەری دنیادا، لەبەردەمی حەماسدا دۆڕاندی و حیزبێکی تر هاتە جێگەی، لەکاتێکدا ئیسرائیلیەکانیش هەمان مەترسیان لە سەرە لەلایەن فەلەستینیەکانەوە، هەرچەند. توشی قەیرانێك یان تەنگوچەڵەمەیەك دەبن لەنێوان خۆیاندا، راستەوخۆ بڕیاردەدەن هەڵبژاردنێك دەکەن و سەرلەنوێ پەرلەمان و حکومەت نوێ دەبنەوەو کۆمەڵێك خەڵکی پێشو جێگە چۆڵ دەکەن بۆ خەڵك تر، لەبەرئەوە نهێنی مانەوەی ئیسرائیل لەوەدایەو نهێنی سەرنەکەوتنی فەلەسینیەکانیش لەوەدایە کەچاکسازی ناکەن، ئەوە بیانویەکە هەمیشە ئەوانەی کەچاکسازی ناکەن و دەستیان گرتوە بەدەسەڵاتەوەو دەیانەوێت هەرگیز دەسەڵاتیان لەدەست نەیەتە دەرەوە ئەوە دەکەن بەبیانو، ئەگینا حاڵی حازر ئێمە هیچ مەترسیەکمان لە سەر نیە، دەتوانین هەمو چاکسازی و گۆرانێك بکەین.

**بەهرۆز عەلی: باسی بزوتنەوەی فەتح و دۆڕاندنی بەرامبەر**

**بەبزوتنەوەی حەماست کرد، ئەمە تا چەند دەشێت ئەو ئەزمونە لێرە روبدات و هاوشێوەی ئێرەیە؟**

- سەردار عەبدوڵڵا: من دەمێکە وتومەو پێم وایە نزیکترین نمونە لەئێمەوە نمونەی فەلەستینە هەندێك دامەزراوە هەیە، دەسەڵاتێکی هەیەو نەبوە بەدەوڵەت، ئێمەش هەروا لەزۆر مەسەلەدا لێکدەچین، لەمەسەلەی گەندەڵیشدا کەمترمان نەکردوە، ئەگەر قسە لە سەر گەندەڵیش بکەین وەك لە سەرەتادا ئاماژەم پێدا رەفتارو ئەخلاقیاتی سەردەمی بەرەی کوردستانی دواتر گواسترایەوەو ئێستاش گواستراوەتەوە بۆ ئێرە، من قسەیەك دەکەم بۆخۆشم تەحەمولی دەکەم، پێم وایە گەندەڵی ئیرادەیە، ئیرادەیەکە لە سەرەتاوە کەدێت ئەگەر ئیرادە نەبێت ناتوانێت ئەو هەموە بڕبکات، لێرەشەوە کێشەیەك هەیە، لەکوێدا گەندەڵی دەکرێت و پەرەدەستێنێ؟

دەبێت ئەم پرسیارە بکەین تا قسە لە سەر خودی گەندەڵی بکەین و قسە لە سەر چاکسازی بکەین، دەبێت قسە لە سەر ئەو ژینگەیە بکەین کە گەندەڵی تێدایەو گەشە دەکات کوێیە؟ بێگومان گەندەڵی لەکۆمەڵگە دواکەوتوەکاندا زۆرتر گەشە دەکات، هەمو ئەو قسانەی لە سەر گەندەڵی لەماوەی ئەم ٣-٤ ساڵەدا کردومانە، ئایا گەندەڵی تەمەنەکەی لە وڵاتی ئێمەدا تەنیا ئەوەندەیە؟ بێگومان لەوەڵامەکەدا هەمو کەس دەڵێت نەخێر، بەڵام قسەکە لەکوێدایە، بەشێکی پەیوەستە بەوەی کە ئێمە لەبەر مەترسی سەدام قسەمان نەکردوە، بەڵام بەشێکی پەیوەندیی بەدواکەوتویی کۆمەڵگەکەمانەوە هەیە کەپێم وایە گەندەڵیی نەببو بەکێشە، واتە ئەوکاتە دەبێت بەکێشە کەهۆشیاری هەبێت، دیارە هەیە، بەڵام کاتێك دەبێت بەکێشە کەهۆشیاریەکی فراوان بۆ کێشەکە هەبێت و ئیرادەیەك هەبێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، لێرەوە کە گەندەڵی دەبێت بەکێشە، پەیوەندیی بەدو سێ شتەوە هەیە، یەکەمیان کەڵەکەبونەکەی گەیشتوەتە ئاستێك کەئیتر بێتام بوە، دوەم پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە ئەو نمونەیەی کاك نەوشیروان لە سەر فەلەستین باسی کرد، زۆر نمونەیەکی باشبو، دەمانباتەوە ئەوەی کە ئێمە لەدوای روخاندنی سەدامەوە ئەمریکا دێتە ئەم ناوچەیەو ئەمریکا پرۆژەیەکی پێیە بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە، ئەم پرۆژەیە لەبنەمادا پرۆژەیە بۆ چاکسازیی لەبوارەکانی ئابوری،

سیاسی، کۆمەڵایەتی، فیکر، خوێندن، بواردانی زیاتر بەژنان، ئەم پرۆژەیە کە دێتە ئەم ناوچەیە، لەبەرامبەر کۆمەڵێك رژێمی تۆتالیتاری دێت کە ئەو گۆڕانکارییە دیموکراسیانە دەبەسترێنەوە بەتیرۆرەوەو چارەنوسی ئەو رژێمانە بەتیرۆرەوە دەبەسترێن، لێرەوە برەودان بەتێڕوانینی ستراتیژی ئەمریکا بۆ گۆڕین لەناوچەکە ئەوەیە کە دان بەهەڵەی شەست ساڵەی خۆیدا دەنێت لەوەی کەپشتیوانی دیکتاتۆریەتی کردوە، بۆ بەدەستهێنانی ئاسایش و سەقامگیریی لە سەر حسابی ئازادی، لێرەوەیە کە ئەمریکا پرۆژەیەك دەهێنێتە ناوچەکە، لەوە دەردەچێت کەئێمە لەناو دۆڵێکی داخراودا سەرکوت بکرێین، لەوە دەردەچێت ئێمە لەناو دیاردەیەکی جیهانیداین، لەناو دیاردەیەکی رۆژهەڵاتی ناوەراستیداین، ئێستا سەرتاسەری کەناڵەکانی ئەم ناوچەیە کەناڵەکانی راگەیاندن، هەژمونێکی زۆریان هەیەو بەبەردەوامی قسە لە سەر ئەم مەسەلانە دەکەن، زیادبون یان پەیدابونی هۆشیاری بۆ کێشە دەگەڕێنمەوە بۆ زیادبونی رێژەی گەندەڵیەکە کەگەیشتوەتە ئاستێك لەبێدەنگی دەرچوەو سنوری بەزاندوە لە هەمو بوارەکانداو پێم وایە کۆنترۆڵکردنیشی بەم میکانیزمانەی کەئێستا باسدەکرێن نەك هەر ناکرێت، بەڵکو ئەوە جۆرێکە لەخۆخەڵەتاندن.

**بەهرۆز عەلی: کاك عیماد لە سەر ئەوە تێڕوانینتان چیە؟**

عیماد ئەحمەد: من پێم خۆشە ئەوە یەکلایی بکەینەوەو سنورداری بکەین، ئەو گۆڕانکاریەی کە لە کوردستان کەپێویستە مەرجی سەرەکی گەندەڵیەکە نیە، چونکە گەندەڵی لە هەمو شوێنێکی جیهان هەیە، ئێستا قۆناغێکی تر هاتوەتە پێشەوە، قۆناغە نوێیەکە دوای نەمانی بەعس، دوای دروستبونەوەی عیراقی نوێ، پاش ئەوەی فیدرالیی لای خۆمان، دامەزراوەی فیدرالی، هێنانی ناوچە تازە رزگارکراوەکانی لای خۆمان بۆ ژێر سایەی کوردستان ئەمە لە سەر ئەو بنەمایەیە کە سەرکردایەتی سیاسی کوردستان و دامەزراوەی سیاسی کوردستان دەبێت لەو ئاستەدا بێت، واتە ئەمە بنەمایەکە، شانبەشانی ئەوە تۆ ئەگەر گەندەڵیەکە بکەیتە بنەماو بڵێت مادام ئەم گەندەڵیە هەیە، ئێمە دەبێت گۆڕان بکەین، ئەمە ئەرکە سەرەکیە نیشتمانیەکەت لێ تێکدەدات، من ناڵێم گەندەڵی نیە، ناڵێم نابێت دژی

گەندەڵی بوەستینەوە، واتە گەندەڵی بۆخۆی ئەنجامە، هەندێك هۆكار كەسەرەتا ئامارژەمان پێدا، كەدامەزراوەی دیموكراتی، كۆمەڵگەی مەدەنی نەبون، پاشماوەی بەعس هەبوە، شەڕی ناوخۆ بوە، لەشاخەوە هاتوینەتە شار، لەمەشروعیەتی شاخەوە بۆ مەشروعیەتی دەستوریی و یاسایی، كاتی دەوێت لەكۆی ئەم هۆكارانە، دیاردەیەك دروستبوە كەپێی دەوترێت گەندەڵی، ئەو گەندەڵیە لەوانەیە كەئاستی ئیدارەو سیاسەت و دامەزراوەی خۆت چاك دەكەیت لەلایەك قۆناغەكە دەبڕیت، لەلایەكی تریشەوە دژی گەندەڵیش دەبێت، ئێمە دەبێت لە سەر دو قاچ بڕۆین، ئەوە بكەینە حاڵەتێك، چونكە وەك كاك لاوەند باسیكرد هەندێك كەس هەیە خۆی كۆسپە لەبەردەم پرۆسەیەكی لەو جۆرەدا، چونكە لەدەسەڵاتی خۆی كەم دەكاتەوە، بەڵام ئەگەر حاڵەتێكی بابەتی هەبێت بۆ دروستبونەوەی بزوتنەوەیەكی ترو دامەزراوە بۆ قۆناغێكی دیكە، ئەمە هۆكارێكی یاریدەدەرە كەكەس ناتوانێت بەرامبەری بوەستێت و شان لەشانی بدات، من ئەوە ناڵێم گەندەڵیەكە فەراموش بكەین، بەڵام ئەركە مێژویەكەی خۆشمان لەبیرنەكەین كەقۆناغێكی ترمان پێویستە، دامەزراوەی دیكەمان لەو ئاستەدا پێویستە، نەك لەساڵی ١٩٩١ یەكێتی بەجۆرێك بوە، تادوای ١٥ ساڵی تر یەكێتی دەبێت جۆرێكی تر بێت، چونكە ئەركەكەی گۆڕرا، من تەنانەت لەوانەی تر كەقسەمان لە سەركرد لەكەموكوڕیەكانی ئەو ١٥ ساڵەی رابردو، كەموكوڕیەكی دیكە هەیە كەئامارژەمان پێنەداوە، كەلاوان و ئەم نەوە نوێیەیە ئایا توانیومانە لێیان تێبگەین، ئەمەش هۆكارێكە كەنەوەیەكی نوێ هاتوەتە ئاراوە، نەوەی ئینتەرنێت و نەوەی جیهانگیری و سەتەلایت، ئێمە وەكو دامەزراوەی حیزبی و سیاسی و دەوڵەت توانیومانە لەخواستەكانی ئەوان تێبگەین و توانیومانە ئەوانە بێنینە سەر گۆڕەپانی خەبات و بزوتنەوە سیاسیەكە؟ ئەمەش مەسەلەیەكە كەباسمان نەكردوە، بۆیە ئێمە دەبێت قۆناغەكانی خۆمان ببڕین، بەڵام نابێت گەندەڵیەكە لەبیربكەین و بینای دامەزراوەی خۆشمان بكەین.

**بەهرۆز عەلی: كاك نەوشیروان تێبینیت چیە لە سەر قسەكانی كاك عیماد؟**

- نەوشیروان مستەفا: من هیچم نیە نەخێر.

- سەردار عەبدوڵڵا: من بۆچونەکەم پێچەوانەی بۆچونی کاک عیمادە، من پێم وایە ئەو هەمو ئەرکەی کە کاک عمیاد باسیکرد لەناوچە داگیرکراوەکان و رزگارکردنیان و هێنانەوەیان بۆ سەر هەرێمی کوردستان و هەمو ئەوانە لەسایەی واقیعێکدا ناکرێت خۆی سەرکردایەتیەك کە دەتوانێت ئینجازی گەورە بکات، دەبێت متمانەیەکی گەورەی لەناو خەڵکدا هەبێت، بۆیە بەهەر هۆیەکەوە سەرکردایەتیەك رێژەی متمانەپێکردنی دابەزیبێت، ناتوانێت متمانەی ئەو خەڵکە بەدەستبهێنێت لە هەمو مەسەلەکاندا، هەر یەك دو جارێك خەڵکی چاوترسێن دەکرێن بەمەسەلە چارەنوسسازەکان، ئەگەر وانەکەین و ئەگەر دەنگ بەمە نەدەین چارەنوسیمان دەکەوێتە مەترسیەوە، من پێموانیە کە ئەمە بۆ قۆناغێکی تر بردەکات، پێچەوانەکەی راستە، پێناسەی من بۆ گەندەڵی جیاوازە لەوەی کاك عیماد دەیکات، گەندەڵی تەنیا ئەوە نیە قسە لەوە بکەین کە لێرە گەندەڵی هەیە و لەوێ حکومەت بەجۆرێك حوکم دەکات و حیزب بەجۆرێکی تر دەست وەردەدات، ئەمانە روکاری گەندەڵین، گەندەڵی چوەتە ناو رەگەکانی کۆمەڵایەتیمانەوە، رەگی گەندەڵی ئەوەیە کە دوای ئەو ١٥ ساڵەی کە کاك عیماد باسی دەکات نەوەیەکی دیکە نەهاتوە نە لەناو یەکێتی و نە لەناو ئەحزابی تر بتوانێت و ئەوەندە بوێربێت بەسەرکردایەتی پێشو بڵێت من پرۆژەیەکی جیاوازم هەیە، ئەوکاتە کەواقیعێك توشی گەندەڵی دەبێت ئەوەیە کە واقیعێك لەگەشەکردن دەوەستێت واقیعێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی.

**بەهرۆز عەلی: کاك نەوشیروان و کاك عیماد کەهەردوکیان سەرکردەن لەناو یەکێتیدا، ئایا ئەگەر پرۆژەیەکی لەو جۆرە هەبێت سەرکردایەتی یەکێتی تا چەند ئامادەیە پێشوازیی لەو پرۆژەیە بکات؟**

- نەوشیروان مستەفا: من بۆچونێکم هەیە لە سەر قسەکانی کاك سەردار ئەوەی کە ئەو باسیکرد قسەیەکی راستە، ئەگەر ئێمە بمانتوانیایە دەوڵەتی موئەسەسات دروست بکەین، ئەم سەرکردایەتیەش نەمایە، ئەوەی کە دەهاتە جێگەی درێژەی بەو سیاسەتە دەدا بۆ رزگارکردنی ناوچەکان و بۆ چاککردنی رەوشەکە، بەڵام هەتا ئەوکاتەی تۆ دەوڵەتی موئەسەسات و حیزبی موئەسەسات دروست نەکەیت، ئەم کۆمەڵەی ئێستا

ئەگەر نەمان ئەوا ئەو مەترسیانە هەیە کە کەرکوکیشت لەدەست بچێت و خەڵکەکە دەتۆقێنیت، بەڵام ئەگەر حیزبی موئەسەساتت دروستکرد هەمو سەرکردایەتیەکە نەك خۆیان وازبێنن ئەگەر بشکوژرێن کۆمەڵێکی تر دەبن و درێژە بەڕێگاکە دەدەن و بەسەر هەمان ڕێبازدا دەڕۆن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان، لەحکومەتەکەشدا بەهەمان شێوە دە جار هەڵبژاردن بکرێت، کابینە بگۆڕدرێت و وەزیرەکان بگۆڕدرێن، حکومەتەکە یەك ڕێبازو یەك یاسای هەیە لە سەری دەڕوات و جێبەجێی دەکات.

- کاوە محەمەد: من تێبینیم لە سەر ئەوەیە، لە هەمو موئەسەسەیەك چ حیزبی بێت یان حکومی ئەگەر نوێبونەوە لەو دەزگایەدا هەبێت، پێوانیە گەندەڵی بێتە پێشەوە ئینجا تۆ باسی چاکسازی و نوێبونەوە بکەیت، واتە نوێبونەوە دەبێت بەبەردەوامی لەناو هەمو دامەزراوەیەکدا سیاقێکی هەبێت، بۆئەوەی بتوانێت درێژە بەخۆی بدات و بۆنمونە وابکات تەنیا حیزبی ئەم قۆناغە نەبێت، بەڵکو حیزبی ئایندەش بێت، واتە هەمیشەیی بێت، ی.ن.ك هەر لە سەرەتاشەوە کەدروست بوە هەمیشە بەو دیدو تێڕوانینەوە سیاسەتی کردوەو سەرکردایەتی شۆڕشی کردوە، هەستدەکەم ئەوەی کەیەکێتی لەحیزبەکانی دیکە جیاکردوەتەوە ئەوە بوە، بەڵام بەداخەوە ئێستا ی.ن.ك-یش کەوتوەتە ناو ئەو سیستمەی کەئێستا تەحەکوم بەدەسەڵاتی سیاسی کوردستانەوە دەکات و هەندێك لەو جیاوازیانە زۆر کاڵبونەتەوەو کەمبونەتەوە لەگەڵ حیزبی تر.

ی.ن.ك ئەگەر بەردەوامیی بەو چوارچێوەیەی خۆی بدایە زیاتر گەشەی دەکرد، هەر خۆی لەخۆیدا یەکێتی کەدروستبو، کۆمەڵێك گەنجی ڕۆشنبیر بون، کاك نەوشیروان بۆخۆی یەکێك لە سەرکردە دامەزرێنەرەکان بوە کەئێستا لەگەڵمان دانیشتوە، هەمویان لەتەمەنی ٢٥-٣٠ ساڵیدا بون، تەماشادەکرێت لەدوای ئەوەوە ی.ن.ك نەیتوانیوە لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەو بەتایبەتی لەم چەند ساڵەی دواییدا خۆی نوێ بکاتەوەو بتوانێت ئەو جیاوازیانەی خۆی درێژەپێبدات، ئەم مەسەلەی نوێبونەوەیە ئەگەر هەبێت، ئەوا پێم وانیە گەندەڵی بەو شێوەیە ببێتە ئەو هەڕەشەیەی کەهەمیشە بکەوینە بەرامبەر کۆمەڵێك پرسیارو بەبنبەستت بگەیەنێت. مەسەلەی نوێبونەوەش کەکاك عیماد ئاماژەی پێدا، ئایا ئیستیعابی وزەی ئەم هەمو گەنجە کراوە، من

پێم وایە هەمو رێگاکان دەچنەوە سەر ئەو رایەی کە بەڵێ ئێمە بیرکردنەوەیەکی دامەزراوەییمان نەبوە، ئەگەر دامەزراوەیی هەبێت، چۆن هەر لەناو حیزب خۆی پەیڕەو دادەنێیت و لەکۆنگرە جێگیری دەکەیت، چۆن پەیڕەو پێشێل دەکرێت؟ تەنانەت ئەگەر پەیڕەو پێشێل بکرێت نەك لەلایەن کەسێکی نامۆ یان کەسێکی نەشارەزا، بەڵکو لەکەسێکی سەرکردایەتی حیزبەکەوە پێشێل بکرێت، واتە تۆ ئەگەر کۆمەڵێك پیرۆزیی و بنەمات لەحیزبەکەدا نەبێت، ناتوانیت ئەو گۆڕانکاریانە بێنیتە پێشەوەو بتوانیت حیزبێك بیت کەهەمیشە خۆت نوێ بکەیتەوە، ئەوەی کە زۆر گرنگیشە لێرە لەو کەموکوڕیانە کە ئەو دامەزراوەییە نەبوە، ئەوەیە کە ئەو تێکەڵیەی دروستکردوە لەحیزب و حکومەت، واتە بەڕاستی ئێستا هەندێك بڕیاری حکومەت حیزب دەریدەکات، یان بڕیاری حیزب لەحکومەتەوە دەدرێت، تێکەڵیەکە کەهیچ جیاوازییەك نابینیت کەئەمەش زۆر رێگای خۆشکردوە بۆئەوەی گەندەڵی بچێتە ناو هەمو کونج و کەلەبەرێکەوە.

**بەهرۆز عەلی: کاك عیماد ئەگەر تێبینیت هەبێت؟**

- عیماد ئەحمەد: گەندەڵی لەکاتی شۆڕشیش هەبوە، بەڵام رێوشوێن چیە؟ لەشۆڕشیش ئەوە کاك نەوشیروان خۆی یەکێك لە سەرکردە سەرەکییەکانی ناو شۆڕشەکە بوەو رۆڵی بنەڕەتیشی هەبوە، جار هەبوە چەندی کەس لێپێچینەوەی لەگەڵ کراوە لە سەر دزی، لە سەر بێ رەوشتی، لە سەر جێبەجێنەکردنی ئەرکی شۆڕش، دوای شۆڕش بۆ ئەوە نەکراوە؟

- نەوشیروان مستەفا: من لەحکومەتدا نەبوم لەو برادەرانە بپرسە کە لەحکومەتدا بون، تا ئەو زەمانەی من دەسەڵاتم هەبوە کردومە.

- عیماد ئەحمەد: لەکاتی شۆڕشدا هەندێك دیاردە هەبوە، دژایەتی کراوە، لەدوای راپەڕین دیاردەکان هەبون، دژایەتیەکان وەکو پێویست دەزگاو دامەزراوەیەك نەبوە هەڵیتەکێنێت، هەروەها حەزدەکەم خاڵێکی تر باس بکەم سەبارەت بەگەندەڵی، گەندەڵی رێژە زۆرەکەی لەناو لایەنە سیاسی و سەرکردایەتیە سیاسیەکەیە، لەناو فەرمانبەرانی بچوکدا کەمتر رودەدات، کەئێمە دەڵێین دژی گەندەڵی بین، لەلایەن ئەوانەوەیە کە پێگەی سەرکردایەتیان هەیە، پێگەو رۆڵی سەرەکیان هەیە

لەیەکێك لەدەزگاو دامەزراوەکان، لێپێچینەوەش زیاتر ئەوان دەگرێتەوەو رێوشوێنێکی ئەوتۆ نەگیراوەتەبەر کە لە سەرەتاوە عیماد هەڵەیەکی کرد سەردار ناتوانێت دوبارەی بکاتەوە، ئینجا ئەمە لەلای خۆمەوە کەئێستا سەیردەکەم، ئێمە خۆمان یەکێك لەوانەین، حیزب نەهاتوە لێپێچینەوە لەگەڵ من بکات کە خراپ بوم، ئیجرائاتێکم لەگەڵ بکات و خۆم دەڵێم ئەگەر لەگەندەڵیدا بوم هەقە لەکۆنگرە دەنگم پێ نەدەن، هەقە مەکتەبی سیاسی ئیجرائاتم لەگەڵدا بکات بڵێت تۆ لەم مەسەلەیەدا فاشل بویت، هەڵەت کردوە، پاش ئەوەی کە لەگەڵ من بکرێت لەخوارەوەش کەس ناوێرێت بەڵام ئەگەر لە سەرەوە نەکرێت، لەخوارەوەش نەخۆشیەکە بڵاودەبێتەوە.

- نەوشیروان مستەفا: من بۆچونێکی جیاوازم هەیە لەگەڵ کاك عیماد، من پێم وایە چ لەحیزب و چ لەحکومەتەکەشدا گەندەڵی هەیە، بەڵام گەندەڵی لەحکومەتەکەوە داکەوتوە، ئەو گانگرینە لەحکومەتەوە کەوتۆتە ناو حیزبەکە. چونکە پارەو بودجە لەلای حکومەت بوە، دادگا لەلای حکومەت بوە کەدەیتوانی وەزیری دز بدات بەدادگا، ئەنجومەنی وەزیران هیچ کاتێك نەهاتوە لەمەکتەبی سیاسی بڵێت من گرێبەستێکم کردوە بەئەوەندە ملیۆن دۆلار، ئایا ئێوە رازین یان نا، جاری واهەبوە هەر بەدزیەوە کردویانە، کەس نەیزانیوە، وەزیرەکە کردویەتی، وەزیرەکانی تریش نەیانزانیوە، واتە لەئەنجومەنی وەزیراندا جارێك لەجاران نەچون باسی ئەوە بکەن بڵێن فڵان وەزارەت بایی ٥٠ ملیۆن دۆلار گرێبەستی کردوە بزانین لە روی یاسایی و ئابوریەوە ئەم گرێبەستە چیە؟ نەك بەمنیان نەوتوە، لەئەنجومەنی وەزیران خۆشیان باسیان نەکردوە، جگە لەوە، یەکێتی پارە لەکوێ وەردەگرێت، یەکێتی پارە لەحکومەت وەردەگرێت، دو جار بهاتنایە بیانگوتایە ئەو پارەیەی ئێوە وەریدەگرن زیادە لەپێویست، لەمەکتەبی سیاسی باسیانبکردایە، رەنگە بمانسەلماندایە، بۆنمونە ئەو بودجەیەی کە ساڵی رابردو داویانە بەمەکتەبی سیاسی ی.ن.ك و فەرماندەیی پێشمەرگە من ئاگاداری نیم، چۆنیان داوە من نایزانم، من لەمەکتەبی سیاسیش بوم.

**بەهرۆز عەلی: بۆچی؟**

- نەوشیروان مستەفا: چونکە ئیشی ئێمە نییە.
- عیماد ئەحمەد: من دەپرسم حکومەت ئیدارەی حیزب دەکات یان حیزب لەواقیعدا ئیدارەی حکومەت دەکات؟ ئەگەر ئێمە گەندەڵ بین، رێژە زۆرەکەی بۆ سیاسیەکانە.
- نەوشیروان مستەفا: من لەکاك عیماد دەپرسم من و تۆ هەردوکمان لەمەکتەبی سیاسیداین، تۆ لەحکومەتیشدایت لەساڵی رابردودا بودجەی حکومەتەکەی ئێمە سەرو یەك ملیار دۆلار بوە، چۆن سەرفتان کردوە؟ جارێك چونە پەرلەمان بڵێن وا سەرفمان کردوە؟ بەمەکتەبی سیاستان گوتوە، بەسەرکردایەتی یەکێتیان گوتوە، جارێك لەئەنجومەنی وەزیرانەکەی خۆتاندا باستان کردوە بڵێن وا سەرفمان کردوە؟ کەشتێك شەفافیەتی تیانەبێت، بۆنمونە لەحکومەتەکەی ئێوەدا رەنگە بایی ٥٠٠ ملیۆن دۆلار گرێبەستتان کردبێت، هەندێك لەو گرێبەستانە هەندێك جار جگە لەوەزیرەکە کەسی دیکە ئاگای لێی نیە، من بۆ بەرپرسم لەگەندەڵی، لەناو حکومەتدا سەرۆکی حکومەتەکە مەسئولە، لەرێکخستندا مەسئولی مەکتەبەکە مەسئولە، لەناو شوێنەکانی تریشدا ئەوەی من مەسئولی بم، من مەسئولم لێی، بۆچی دەهێڵن گەندەڵی بڵاوبێتەوە؟

**بەهرۆز عەلی: هەڵبەتە حیزب حکومەت بەڕێوەدەبات؟**
- نەوشیروان مستەفا: نەخێر حیزب حکومەتی بەڕێوەنەبردوە، حیزب کۆمەڵێك کەسی کاندیدکردوە کەبچن ببن بەوەزیر، وەختێك کەبون بەوەزیر، ئەسڵەن هەر بۆ کۆبونەوەکانی مەکتەبی سیاسی هاتون.
هۆکاری ئەوەی کەبۆچی گەندەڵی بڵاوبوەتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ دو شتی زۆر سەرەکی، یەکێکیان ئەوەیە کە ئێمە پەرلەمانمان نیە کە لەحکومەت بپێچێتەوە، دوەمیان ئێمە کۆنگرەمان نەبەستوە تا کۆنگرە لێپێچینەوە لەگەڵ سەرکردایەتی بکات، سێیەمیش مەکتەبی سیاسی دەسەڵاتی ئەوەی نەبوە کە لەحکومەت بپێچێتەوەو فلان وەزیر لابەرێت و ئەوەیان بەرێت بۆ دادگا، دەسەڵاتی ئەوەی نەبوە، سبەینێ لەکۆنگرەدا خەڵك دێن یەخەی ئێمە دەگرن، ئێمەش لەبەردەمی ئەوانەدا بەرگریی لەخۆمان دەکەین، من وەکو بۆم باسکردیت لەبودجەی ساڵی رابردودا کە بەحساب یەکێکم لەوانەی کەزۆر زۆر دەسەڵاتدارم لەمەکتەبی

سیاسیدا بودجەیان چۆن سەرفکردوە، من ئێستاش نازانم چۆنیان خەرج کردوە.

جا ئەم سەردەمە سەردەمی شەفافیەتە، ئەگەر بمانەوێت دەزگاو دەوڵەتی دامەزراوەیی دروست بکەین، بمانەوێت لەبەردەم میللەتەکەماندا سەربەرزبین و لە هەمو هەڵبژاردنێکدا بەبێ ئەوەی بیتۆقێنین ئەوەی کە کاک سەردار وتی، بەخزمەتگوزاری خەڵك راکێشین بەلای خۆماندا، پێویستە شەفافیەت هەبێت، بۆنمونە گرێبەستێك دەکەیت بایی ئەوەندە دۆلارە بۆچی بیشاریتەوە، ئەگەر کەموکورییەك لەگرێبەستەکەدا نەبێت، با کوردستانی نوێ‌ش بیزانێت خەڵکیش بێت بیخوێنێتەوە، ئەگەر هیچ نەبێت بەرگری بکەم، یان ئەگەر لایەنێك زانی کەموکورتیەکی تێدایە بچێ شکاتی لێ بکات، بڵێ ئەمەماڵی خەڵکە، ماڵی میللەتە، سەروەتی میللەتەکەیە، بۆ بەخۆڕایی خراپ بەکاری دەهێنن، بۆ لایەنێکی وانەبێت. بۆیە دەبێت میکانیزمێکی لەو جۆرە بدۆزینەوە، بێگومان لەحیزبدا کۆنگرە چارەسەری ئەوە دەکات، ئێمە لەدوای راپەرینەوە لە١٥ ساڵی رابردودا ٢ جار کۆنگرەمان بەستوە، نازانم کۆنگرەی سێیەم کەی دەبەسترێت؟ پەرلەمانەکەشمان ئەو پەرلەمانەیە کەخۆتان دەزانن، لەبەرئەوە شوێنێك نیە لێرە کەبتوانێت لێپێچینەوە لەگەڵ وەزیرەکاندا بکات، دیوانی چاودێری دارایی بەسەدان راپۆرتیان نوسیوە لە سەر فەرمانبەرە گەورەکانی حکومەت، لە سەر وەزیرەکان تائێستا یەك کەسیان نەدراون بەدادگا.

**بەهرۆز عەلی: کاك عیماد تێبینیت چیە؟**

- عیماد ئەحمەد: سەبارەت بەراپۆرتەکان، مادام مەکتەبی سیاسی منی داناوە، وەزیرەکانی داناوە، مەکتەبی سیاسیش دەتوانێت موحاسەبەی ئەو برادەرانە بکات. کە نەیکردوە چونکە وەك کاك نەوشیروان باسیکرد پەرلەمان نیە، کەپەرلەمان لێپێچینەوە نەکات، هەقە لەلایەن مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتیەوە لەم حکومەتە بپرسرایەتەوە، کە یەکەمجار من سنور بەزێنیم بکردایە، بانگبکرامایە، جارێکی تر کەس دوبارەی نەدەکردەوە، چونکە ئەمانەی کەدانراون مەکتەبی سیاسی یەکێتی دایناون، ئەگەر مەکتەبی سیاسیش نەبێت ئۆرگانەکانی تری یەکێتی دایناون، کەمن لەلایەن یەکێتیەوە

دانرام، حەقە یەکێتی لەخراپیدا لێپێچینەوەم لەگەڵدا بکات و لەچاکیشدا دەستخۆشیم لێبکات، کە ئەوە نەکات ئەوە لەرۆڵی خۆی دەرچوە، چونکە وەکو باسمان کرد پەرلەمان نییە، ئەگەر پەرلەمان هەبێت ئەوە شتێکی دیکەیە.

لەحاڵەتێکی تردا ئەو راپۆرتانەی چاودێریی دارایی کەهەیە ئێستا گەیشتوەتە ١٥٠٠ راپۆرت، زۆربەی کاری لە سەرکراوە، بەڵام ئەو کارە وەکو پێویست نیە، هۆکەشی ئەوەیە ئەگەر ئەو کارە یەکێك بگرێتەوە، برادەرێك بەرگریی لێدەکات، هەر لەناو خودی خۆمان لێپرسینەوە لەگەڵ یەکێك دەکرێت، یەکسەر دەڵێن تۆ بۆ نایکەیت؟ واتە ئێمە (٤) حکومەتمان هەبوە حکومەتی د. فوئاد، حکومەتی کاك کۆسرەت، حکومەتی د. بەرهەم، حکومەتی کاك عومەر، ئەگەر بەناوی شەخسەکان داینەنێین وەکو شتەکانی تر، هەر حکومەتێکی تریش داینێین، ئەگەر گۆڕانکارییەك نەبێت لەسیستمی ئیداریمان، هەمان حاڵەت دوبارە دەبێتەوەو کەموکوڕیی لەسیستمەکەمان هەیە.

لاوەند نەوزاد: بۆنمونە من لێپرسراوی شوێنێکم، میکانیزمێك نیە بۆئەوەی بزانم ئیشی خۆم بکەم، بۆئەوەی کەسێك کەدەزانم بەملیۆن دۆلاری خەڵکی خواردوە کاتێك من ١٥-٢٠ ساڵە باسی سەروەریەکانی بۆ دەکەم شتێکە کە ٢٥ ساڵ لەمەوپێش کراوە دەمەوێت پێی بفرۆشمەوە، کابرا بیری نیە، بۆچی ئیستیقالە ناکەیت، بۆچی سەرۆکی حکومەت ئیستقالە نادات، بۆچی کاك نەوشیروان لەمەکتەبی سیاسی ئیستقالە نادات؟

- عیماد ئەحمەد: ئیستقالە چارەسەر نیە، گۆڕەپان چۆڵ نەکەیت باشترە.

- کاوە محەمەد: ئەم گفتوگۆیە دەمانگەیەنێتە سەر ئەوەی کە ئەو پرسیارە بکەین، لە سەرەتاوە بنەمای کاندیدکردنی کەسێك بۆ سەرۆکی حکومەت، بۆ جێگر، بۆ وەزیری چیە؟ بەڕاستی دەبێت ئێمە بیر لەوە بکەینەوە کە ئەوانە چۆن دادەنرێن؟ من پێم وایە ئەو دابەشبونەی کە لەناو حیزبدا هەیە، ئەوە خۆی وادەکات کەکاندیدکردنەکان لە سەر بنەمای لێوەشاوەیی نەبێت، هەرچەندە دور نیە هەندێکیان لێوەشاوەبن و مەسەلەی ئەوەی ئەم برادەرە سەر بەفڵانە تەکەتولەو ئەویان سەر بەفڵانە تەکەتولە، هۆی چیە لێپرسراوێتی وا خۆشەویست بوە، ئێستا شەڕ لە سەر کورسی دەکرێت؟ بەو شێوەیە دەستی لێ بەرنابێت

نەئیستقالە دەدات، نەوازی لێ دەهێنێت؟ ئەو هەمو پارەیەی لەبەردەستە، بوارێکی ئەوتۆ هەیە کە گەندەڵی ئیداری و دارایی هەبێت، بەڕاستی سەردەمی شاخ کاک نەوشیروان ئێوە لەناو وەزعەکەدا بون، نمونەی سەرکردە لەلای پێشمەرگەو بنکە ئەوە بو کە لەپێشەوەی بەرەکاندا شەڕدەکات، نمونەی ئەوەش زۆر لە سەرکردەکانمان شەهیدبون، هەمیشە لەشەڕەکان لەناخۆشییەکان لەناو پێشمەرگە تێکەڵ بون، لەدوای راپەڕینیشەوە دەبینین وێنەی سەرکردەو مەسئول، ناڵێم مەسئولێك بێت وەك هاوڵاتیەکی سادە بژی، لەهیچ وڵاتێکیش نیە، بەڵام وێنەی مەسئول وێنەیەکە کە بریتیە لەریزێك ئوتۆمبێل، ڤیلای گەورە، لەهەر شوێنێکی گەشتوگوزاری خانوی خۆشی هەبێت و .. هتد.

کە ئەو ئیمتیازانە وایلێدەکات شتەکان خۆشەویست بن، تەنانەت ئەندام و کادری حیزبیش کەبیردەکاتەوە بیر لەوە دەکاتەوە ببێتە سەرکردە.

نەوشیروان مستەفا: کاك کاوە تۆ سەرنوسەری رۆژنامەیەکی رۆژانەی کە گرنگترین رۆژنامەیە لەم ناوچەیەی ئێمە دەردەچێت، لە هەمو دنیادا دو جێگا حکومەت دەخاتە بەردەمی روخاندنەوە، یەکێکیان پەرلەمان، ئەوی دیکەیان دەسەڵاتی چوارەم کەمیدیایە، ئێوە چیتان کردوە بۆ ریسواکردنی گەندەڵی لەم وڵاتەدا؟

- کاوە محەمەد: من پێم وانیە ئەمە پەیوەندی بەوەوە هەبێت کە کوردستانی نوێ یان راگەیاندن چی کردوە،..

- نەوشیروان مستەفا: لەئەمریکاو بەریتانیا میدیا دەتوانێت حکومەت بڕوخێنێت، لە هەڵبژاردندا حکومەتێك دەبیاتەوەو حکومەتێك ئەیدۆڕێنێت، تۆ رۆژنامەیەك دەردەکەیت چی بڵاودەکەیتەوە لە سەر ئەو گەندەڵیانەی لەناو حیزب و حکومەتەکەی مندایە؟

**بەهرۆز عەلی: کاک لاوەند تائێستا شتی واکراوە؟**

- بەڵێ ئەرەوەڵڵا جارێکیان تەلەفۆنیان کردو وتیان بەشەق بیکەنە دەرەوە ئەم قسە قۆڕانە چیە دەینوسێت؟ لەرۆژنامەی خۆماندا چۆن وامان پێدەڵێت؟ وا دەزانێ رۆژنامە بۆ ئەوەیە کەتەنیا مەدحی بکەیت، ئەوەی بڵاوکراوەتەوە ٢٪ یان ٣٪ یان ٤٪-ەکە بڵاوکراوەتەوە، جاری واهەیە گوتویانە ئەگەر حەزدەکات موچەکەی ببڕین با ئەمجارەش هەروا بنوسێت، بەڵام جار بەجار

تاك و تەرا شتێك دەبێت بۆ کێ؟ بۆئەوانەی بێ قاچ و پشت و دەستن، من بیرمە کاتی خۆی بەر لە روخاندنی سەدام زۆربەی ئەو مەسئولانە تورەدەبون کە لە سەر خۆی یان لە سەر دەزگاکەی نوسراوە، ئێستا تورەبونەکەشی نەماوە، ئێستا پێدەکەنێت، تەنانەت ئیمێلێکم بۆ هاتوە دەڵێت کاك لاوەند تۆ ئەگەر لەرۆژنامە نیش بکەیت دەبێت تۆزێك رۆشنبیربیت، تۆ خەریکی چیت و باسی چی دەکەیت، رەخنە لەکێ دەگریت، کێ بەقسەی تۆ دەکات، کێ حسابت بۆ دەکات؟ بۆچی بەدوای نانی خۆت ناکەویت، پارە لای دەسەڵاتە، لای حکومەت و حیزبە، تۆ کەنەتوانیت رۆژنامە دەربکەیت، لە سەر چ بناغەیەك رۆژنامەیەکی حیزبی دنیایەك پارە وەردەگرێت بەڵام چەند رۆژنامەنوسێکی تر دەیانەوێت بێن رۆژنامەیەك دەرکەن، رێگایان لێدەگیرێت، باشە رێگاشیان لێناگیرێت، بەڵام ناوێرن بڵاوی بکەنەوە، خۆ جۆرەها روداو هەیە، خۆ هەمو کەس نایەت شکات لای تۆ بکات.

- نەوشیروان مستەفا: من پرسیارێکم هەیە لەحکومەت، کاك عیماد تۆ ماوەیەك وەزیری تەندروستی بویت و ماوەیەکیش وەزیری پیشەسازی بویت، ئێستاش جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانیت، ئایا لەم حکومەتەدا بەدرێژایی ١٥ ساڵی رابردو وەزیرمان نیە بەشێوەی نامەشروع دەوڵەمەند بوبێت، چەند کەستان داوە بەدادگا؟ چەند بەڕێوەبەری گشتیتان داوە بەدادگا، چەند بریکاری وەزیرتان داوە بەدادگا لە سەر دەست پیسی و لە سەر داوێن پیسی، لە سەر شتی نامەشروع؟ کێ رێگەی لێگرتن؟

-عیماد ئەحمەد: کاك نەوشیروان تۆ لەوانەیە بزانیت و لەمنیش باشتر دەزانیت لەدەرەوەی حکومەتەکە دیفاعیان لێدەکەن، جار بوە ویستومانە برادەرێك بگۆڕین بەسەدان ئەملاوئەولا بەهێنانی تۆ بۆ هاوکێشەکە (من ناو ناهێنم) تا گۆڕیومانە. لەوەزارەتیش ئێستا وەزیر، هەیە خەڵك هەیە پشتی دەگرێت و بەرگریی لێدەکات هەر لەناو خودی خۆماندا، جا ئەوە حاڵەتێك دەکات وەك گوتم دەسەڵاتی ئێمەمانان لەو شوێنانە ئیشم کردوە تا پێم کرابێت، ناڵێم چیم کردوە، بەڵام تا پێم کرابێت دژی گەندەڵی کارم کردوەو دژایەتیم کردوە، بەڵام بڵێین هەمو ئیشەکانمان کردوە، نا.

نەوشیروان مستەفا: کاکە دژ چیە، کابرا ماوەی ئەوەندە ساڵ وەزیر بوە، یان وەکیل وەزیر بوە، پارەیەکی زۆری کۆکردوەتەوە،

خانوی دروست کرد، هەرچی شتی خراپ هەیە کردی، لەدواییدا دەچێتەوە ماڵی خۆی، تەقاعودی دەکەیت، حەرەس و حیمایەی ئەدەیتێ، ئۆتۆمبێلی ئەدەیتێ، ئەمە تەقدیرکردنە، ئەمە هیچ لێپێچینەوە نیە.

- لاوەند نەوزاد: بەڵام لەمەکتەبی سیاسیشدا ئەمە هەیەو هیچ ئیجرائاتیشتان لەگەڵدا نەکردوە، لە سەرکردایەتیشدا هەیە.

- نەوشیروان مستەفا: بەڵێ راستە.

- عیماد ئەحمەد: سەرۆکی زانکۆ دەرکرا، چەند کەس دیفاعی لێکردو چ وەزعێك گۆڕدرا؟

- عارف قوربانی: من تێبینیم هەبو لە سەر ئەوەی کە قسە لە سەر گۆڕان کرا، یەکێك لەو برادەرانە پەیوەستی کرد بەمەسەلەی گەندەڵیەوە کەئێستا گوایە دەنگێك هەیە بۆ گۆڕان یان داوایەك هەیە بۆ چاکسازیی، من پێم وایە کە ئەگەر ی.ن.ك لەدەسەلاتیشدا نەبوایە لەم ١٥ ساڵەی دوای راپەڕیندا، وەك هێزێکی سیاسی ئەگەر تەماشای ئەم هێزە بکەیت خەڵکێکی زۆر لەدەوری کۆبوەتەوە، بەشێکی راستە بەهۆی دەسەلاتەکەیەوە لەدەوری کۆبوەتەوە، بەڵام خەڵکی تریش هەیە بەبێ بیانوی ئەوەی یەکێتی لەدەسەلاتدا بوە هەروەك خۆی لەدەوری ئەم هێزە کۆبوەتەوە، ئەگەر لەدەسەلاتیش نەبوایە هەر پێویستی بەخۆنوێکردنەوە بو، واتە زەرورەتی خۆنوێکردنەوەی یەکێتی تەنیا پەیوەست نیە بەوەی کە یەکێتی حیزبی حوکمڕانە بۆیە پێویستە ئێستا خۆی بگۆڕێ، ئەو میکانیزمانەی کە یەکێتی بۆ خەبات گرتویەتیەبەرو ئەو ئامرازو رێگایانەی کە گرتونیەتەبەر بۆئەوەی لەپێناویدا تێبکۆشێت لەم ولاتەدا، ئەو رێگایانە بۆ ئەم سەردەمە ناگونجێن و پێویستیان بەگۆڕانە، بۆنمونە ئەگەر پەیوەستی بکەمەوە بەوەی کە باسمانکرد، یەکێك لەو هۆکارانەی کە ی.ن.ك وەك چەکێکی کاریگەر لەناو بزوتنەوەی سیاسی کوردو خەڵکدا بەکاری دەهێنێت، راگەیاندن بوە ئایا ئەو راگەیاندنەی کەئێستا یەکێتی بەکاری دەهێنێت ئەم مۆدێلە باوی ماوە؟ پێم وایە کۆی ئەوەی کەقسەی لە سەر دەکەین ئەنجامێکە کە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کەبڕیاری سیاسی لە ولاتی ئێمەدا لەسنوری ئێمەو لەحیزبەکەی ئێمەدا بڕیارێکی سەلیم و تەندروست نەبوە، ئەوەی کەکاك عیماد باسی دەکات ١٠٠٪ راستە، هیچ بڕیارێك لەحکومەتدا بەبێ بڕیاری مەکتەبی سیاسی نەدراوە، بەڵام

کەی مەکتەبی سیاسی ئێمە وەك هەیکەلێکی یەکگرتو ناوی مەکتەبی سیاسی بوە تاوەکو راوێژ بەمەکتەبی سیاسی بکات، رەنگە ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی بۆی هەبوبێت تەحەکوم بەحکومەتەوە بکات بەبێ ئەوەی راوێژ بەمەکتەبی سیاسی بکات، دەیان و سەدان تەندەر لەم ولاتەدا کراوە، برۆ دەمی حکومەت بکەرەوە دەڵێت بەبڕیاری مەکتەبی سیاسی، بەلام من دڵنیام ئەگەر مەکتەبی سیاسی ١٥ کەس بن، رەنگە ١٣ یان ئاگایان لێ نەبێت، بەناوی مەکتەبی سیاسیشەوە دەڕوات کە خەلەلەکە لێرەدایە، ئێمە وەك هێزێکی سیاسی، مەکتەبی سیاسیمان تێکشکاوە، ئۆرگانێکمان نیە بەکردەوە ناوی مەکتەبی سیاسی بێت و خاوەن بڕیاربێت، تەنانەت خەڵك هەیە لە ئاستەکانی زۆر خوارەوە رەنگە ئامادە نەبێت نامەی هیچ ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی بخوێنێتەوەو رەنگە واش ئاراستەکرابێت کە مەکتەبی سیاسی مەخوێنەرەوە، خەلەلەکە ئەمەیە، ئێمە چۆن بتوانین ئەم یەکێتیە وا لێبکەین مەکتەبێکی سیاسی هەبێت و بڕیاربەدەست بێت، مەکتەب سیاسیەك نیەو پەرلەمان نیە بتوانێت کەیاساو وەزیرو سەرۆکی وەزیران بگۆڕێت، گەورەترین نەهامەتی لەم ولاتەی ئێمەدا ئەوەیە دو رۆژ پێش ئێستا لە کوردستانی نوێ-ش قسەی لە سەرکرا بەدو مەکتەبی سیاسی ناتوانن قایمقامێك بگۆڕن، ئیتر مەکتەبی سیاسی چی؟

**بەهرۆز عەلی: کاک نەوشیروان پێشتر ئاماژەی بەوە کرد کەگوتی من لەپێش ٩١-ەوە زیاتر ئاگام لەبارودۆخی سیاسی ناو یەکێتی نیشتمانییە، بەلام لەدوای ٩١-ەوە من کەمتر ئاگام لەو مەسەلانەیە، ئەوە خۆشی ئاماژەی پێکردو لەبیرەوەریی زۆرێک لەکادیرەکانی ناو یەکێتیدایە، ئایا ئەو دورەپەرێزیەی بەڕێزت بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

- نەوشیروان مستەفا: من دورەپەرێز نەبوم، من لەناو حکومەتدا نەبوم، من خۆم باوەڕم بەدابەشکردنی ئیش هەیە، باوەڕم بەوە هەیە کەئێمە کۆمەڵێك خەڵکمان کاندیدکرد بچن ببن بەوەزیر ئیتر من هەمو رۆژێك دەست لەکاریان وەرنەدەم و خەڵك بنێرمە سەری بۆ تەعین کردن من پێی بڵێم وا بکەو وابرۆ، مەگەر لەهەندێك هێڵی گشتیدا، تەنانەت من لەناو ماڵێکیشدا لەناو دوکانێکیشدا ئەگەر ٤ شاگردم هەبو کەئیشەکانم بەسەردا دابەشکردن ئیتر دەست لەکاریان وەرنادەم، ئەگینا من کە

ئەو ماوەیە لە کوردستاندا بوم ئیشی رۆژانەم نەکردوەو ئیشی رۆژانەش بەهی خۆم و بەهی مەکتەبی سیاسی نازانم، ئیشی من ئەوە نیە بچم رۆژانە دەوام بکەم لە سەر کورسی و مێزێك خەڵك بێت موراجەعەم بکات و داوای ١٠٠٠ دۆلارم لێبکات و من مناقەشەی بکەم و معامەلەی لەگەڵدا بکەم و بە٢٠٠ دۆلار ئیقناعی بکەم و یەکێتی تر بێت داوای زەویم لێبکات و یەکێك بێت داوای تەعین بونم لێبکات، ئیشی من نیە، ئیشی مەکتەبی سیاسی ئەوەیە دانیشێت ستراتیژی بزوتنەوەی کورد دابنێت، ئیشی ئەوەیە هەڵوێستی خۆی رون بکاتەوە بەرامبەر ئەو روداوانەی کە لەناوچەکەدا رودەدەن، بەشداری بکات لەکاروباری سیاسیدا، لەپەروەردەکردنی میللەتەکەدا، ئەگینا ئیشی رۆژانە ئیشی فەرمانگەکانی حکومەتە، یەکێك لەهۆکارەکانی ئەوەی کەئێمە سەرمان لێ تێکچوە ئەوەیە بەڕاستی ئیشی حکومەت و حیزب تێکەڵاوبوە، ئێمە ئیشی حکومەت بۆ حکومەت بەجێ بهێڵین و ئیشی حیزب حیزبەکە بیکات. من پێم وایە جۆرێکە لەراستکردنەوەیە لەو چەوتیەی کەهەیە.

**بەهرۆز عەلی: باسی کێشەو کەموکوڕی و دیاردەی گەندەڵی کرا، هەمومان گەیشتینە ئەو بڕوایەی کەپێویستە حیزب خۆی نوێ بکاتەوەو چاکسازی و ریفۆرم بکات، لێرەوە ئەو دەرگایە دەکەینەوە کە کۆمەڵێک هەوڵدان هەبوە بۆ خۆنوێکردنەوە یان چاکسازی لەناو ی.ن.ک کە وەک حیزبێکی سەرەکی لەناو کوردستانداو کە لە سەرەتای دامەزراندنیەوە تا ئەمڕۆ بەچەندین قۆناغدا تێپەڕیوە، توانیویەتی لەدژوارترین و پڕقەیرانترین قۆناغ دەربازبێت، بەڵام ئێستا بۆ دەربازبون لەو کێشانەی کە باسمان کرد چەندین پرۆژە باسی لێوەکراوە، کاک نەوشیروان ئەو پرۆژانەی کە ئێستا خراونەتەڕو تا چەند پرۆژەی موتەکامیل بون؟**

- نەوشیروان مستەفا: پێم وایە هەمویان ئەفکاری باشیان تیایە، پێشنیازی باشیان تێدایە، بەڵام هیچیان پرۆژەیەکی موتەکامیل نین.

**بەهرۆز عەلی: پرۆژەیەکی موتەکامیل لەدیدی بەڕێزتەوە چۆنە؟**

- نەوشیروان مستەفا: کۆکردنەوەی هەمو پرۆژەکانیش بەیەکەوە نابێتە هۆی چاکسازی، من دەمەوێت بیروڕای خۆمت

بەراستی پێ بڵێم کاک بەهرۆز، لەبەرچاوی ئەم برادەرانەش چۆن یەکێك لێرە نەخۆش دەکەوێت و دەچێت بۆ لای دکتۆر، ئەویش دەستنیشانی نەخۆشیەکەی بۆ دەکات، بەڵام لەتوانای دکتۆرەکەدا نیە چارەسەری نەخۆشەکە بکات و دەینێرێتە دەرەوە، هەندێك جار دەستنیشانی نەخۆشیەکەشی بۆ ناکرێت، ئێمە چ وەکو حیزب و چ وەکو حکومەت گەیشتوینەتە قۆناغێك بەبڕوای من ئەگەر بمانەوێت چاکسازی بکەین، بەم دامودەزگایەی ئێستا چاکسازی ناکرێت نە لەناو یەکێتیداو نە لەناو حکومەتەکەدا، مادام یەکێتی ئەندامە لەسوشیالیست ئینتەرناسیونال و حیزبە سۆشیال دیموکراتەکانی جیهاندا، سۆشیال دیموکراتەکان ئەزمونێکی تابڵێی دورو درێژیان هەیە، چ لەحکومڕانیداو چ لەکاری حیزبیدا، دەتوانین وەفدێکی ئەوانە بانگ بکەین، بێن چەند هەفتەیەك لێرەبن، خوێندنەوەیەك بۆ وەزعی یەکێتی بکەن، ئێمەش هاوکارییان بکەین، بۆ کاروباری حکومەتیش کۆمەڵێك پسپۆری دارایی و یاسایی و ئیداری و ئابوری بانگ بکەین کە ئەوان ڕێوشوێنێکمان بۆ دانێن و یارمەتیمان بدەن، چونکە ئێمە خۆمان ئەزمونمان کەمەو پێشمان ناکرێت، بۆنمونە ئێستا ئێمە لەئیدارەی سلێمانی و هەولێر نفوسمان لە ٤ ملیۆن کەمترە، نزیکەی یەك ملیۆن موچەخۆرمان هەیە، ئەمە راستە لە ٤ ملیۆن بەشەر ملیۆنێکی موچەخۆر بێت؟ ئەمە بەئێمە چاك ناکرێت، ئەمە خۆمان وامانلێکردوە، پێویستمان بەوە هەیە چۆن نەخۆشەکە سەفەردەکات بۆ لای دکتۆر، دکتۆرەکە بێنین بۆ ئێرەو دەستنیشانی نەخۆشیەکەمان بکات و چارەسەریشی بکات.

- عارف قوربانی: من پێم وایە کێشەی یەکێتی ئەوە نیە کەپرۆژەیەکی موتەکامیلی نیە، ئەگەر بێتە سەر ئەوەی کە پرۆژەیەکی وەك ئەوەی کاك نەوشیروان باسیکرد، ئەگەر خۆشی پێی نەکرێت، دەتوانێت خەڵکی تر بێنێت و تەکلیفی بکات، کێشەکە ئەوەیە کە ئەم حیزبە ئامادەیی تیا نیە قبوڵی پرۆژە بکات بۆ چاکسازی، حیزبەکە بنەمای چاکسازیی پێ قبوڵ نیە، بۆیە نەیتوانیوە پرۆژەیەکی موتەکامیل پەیدابکات.

**بەهرۆز عەلی: کاک نەوشیروان ئاماژەی بەهەندێک خاڵ کرد سەبارەت بەچاکسازی و ئەو پرۆژەیە جێگای چیتر بێتەوە بەڕای ئێوە بۆ نوێبونەوە؟**

- لاوەند نـەوزاد: من پێم وانیە تائێستا پرۆژەمان هەبوبێت، بەڵکو بیرۆکەمان هەبوە، وەکو ئەوەی هەندێك بیروباوەڕ دەکرێت ببێتە بنەمایەکی باش بۆ پرۆژەیەك، بەلام نیەتمان وایە کە بەکردەوە گۆڕانکاریی بکەین و ئەم وزعە چاك بکەین؟ من پێم وایە نەخێر.
- نـەوشیروان مستەفا: دەمانـەوێت بـەو مـەرجـەی من هەر لەشوێنێ خۆمدا بمێنمەوە!
- لاوەند نـەوزاد: بەلام ئێمە بیرمان دەچێت، زۆرجار گۆڕان لەسیاسەت یان ئیدارە، بەگۆڕانی کەسەکان دێت، بۆنمونە حکومەتێك دێت ١٥ ساڵ کەسێك لەشوێنێکدا حوکمڕانی دەکات، ئەو کەسە لەو ماوەیەدا ئەوەندەی پێدەکرێت کە کردویەتی، یان ئەگەر دەتەوێت فلان وەزارەت چاك بکەیت، فەرمو وەزیرەکە بگۆڕە!
ئەگەر بتەوێت بەهەمان کەس و بەهەمان دەستە لەتەمەنی ٣٠ساڵیەوە تا دەبن بە ٧٠-٨٠ ساڵی تا بەنەخۆشی دەمرن و لەبەر نەخۆشی ناتوانن دەوام بکەن هەر ئەمانە خۆیان حاکم بن هەم خۆیان خەسم بن، هەر خۆیان گۆڕانکاری و چاکسازی بکەن، ئەمە شتی وا نابێت، ئەوەی کاك نەوشیروان باسیکرد کەداوا لەسۆسیالیست ئینتەرناسیۆنال و چەند پسپۆڕێك بکەین، پێم وایە چارەسەرێکی زۆر باشە، بۆچی، چونکە بەنمونە لەفرۆکەخانە کاك عیماد ناچاربون پسپۆڕێك بێنن بۆئەوەی ئیشتان بۆ بکات، باشە ئێمە نیمانە ئەو پسپۆرەمان نیە، چی بکەین، ناچارین خەڵك بێنین بۆمان چاك بکات.

بەهرۆز عەلی: قسەیەك هەیە کەگوایە لەحکومەت دەتانەوێت کۆمەڵێك تەکنۆکراتی بەریتانی بێنن بۆ دامودەزگاکان، کاك عیماد ئەگەر بکرێت لەو بارەیەوە رونکردنەوەیەکت هەبێت؟
- عیماد ئەحمەد: ئێمە با لەباسەکەی خۆمان دەرنەچین، بێینەوە سەر مەسەلەی چاکسازی و جگە لەبەرنامە، میکانیزمی جێبەجێکردنیش بنەڕەتیە، واتە تۆ بەچ میکانیزمێك ئەو بەرنامەیە جێبەجێ دەکەیت؟ ئەگەر تۆ بەرنامەیەکی باشیشت هەبێت، ئەگەر خەڵکی باش نەبێت بۆ جێبەجێکردنی، یان سەقفێکی زەمەنیت بۆ گۆڕانکارییەکان، تۆ هیچت نەکردوە، بۆئەوەی کەسۆسیال دیموکرات بێت یەکێك نیە لەخاسیەتەکانی

ناو یەکێتی، ئەو ئەگەر بێت، لەدەرەوەی خۆمان دێت، ئەوە نیە کەبەرنامەیەکی دانا بۆ چاکسازی، یەکێك لەتەکەتولەکان، یان یەکێك لەبرادەرەکان بڵێت ئەوە لەمنی داوە، چونکە فلانە کەس پشتێتی، میکانیزمیش کاری سەرەکیە.

**بەهرۆز عەلی: ئێستا دێینە سەر بیرۆکە، ئەگەر تێڕوانینی ترت هەبێت دواتر دێینەسەر ئەگەری بونی ئالیەت و چۆنێتی دروستبونی تا بکرێت ببێتە پاڵپشت بۆئەوەی ببێتە هۆی نوێبونەوە یان چاکسازی لەناو یەکێتی ئەگەر وەکو حیزبێکی سەرەکی بەنمونە بیهێنینەوە؟**

- عیماد ئەحمەد: نوێبونەوەیەك کە یەکێتی پێویستە بیکات ئەوەیە کە لەبەرنامەکەی نوێبونەوە هەبێت، لە سەرکردایەتیەکەی، لەدامودەزگاکانی، نوێبونەوە هەبێت، واتە بەو شکڵە نا کەهەر بەناو نوێبوننەوە دەکەم، کە تۆ بەرنامەکەت نوێ بو، دەبێت کەرەستەکەشت نوێ بێت بۆ ئەو بەرنامەیەو کاتێکی دیاریکراویشت هەبێت بۆ ئەو بەرنامەیە، هەروەك لە سەرەتاش باسمانکرد ٤ ساڵە باسی چاکسازیی خۆمان دەکەین، ئەم ٤ ساڵە کەهەمو جارێك باسکراوە نەهاتوین ماوەیەکی دیاریکراو دابنێین بڵێین ئەمساڵ زەمینەخۆش دەکەین بۆ کۆنگرە، کۆنگرە بەم شێوەیە کاردەکات، ئەمە بەرنامەکەیەتی، هەر هاتوین بەگشتی قسە دەکەین، بەو جۆرەش قسەکردن نامانباتە سەر مەسەلە بنەڕەتیەکان، ئەمجارەش کە خەریکین، شتێکی پوختەکراوتر زەمینە بۆخۆشکراوتر، ئامادەیی برادەران زیاتر لەئارادایە، ئایا دەتوانین ئەمە بەرەوپێشەوە بەرین، بەڵام لەوەی پێشتر باشترەو زەمینەکەی خۆشترە.

**بەهرۆز عەلی: کاک سەردار لە سەر بیرۆکەی نوێبونەوە، چی هەرە باش هەیە بۆ ئەوە؟**

- سەردار عەبدوڵڵا: بەرلەوەی قسە لە سەر بیرۆکە بکەین پێم وایە یەك فاکتەری زۆر گرنگ هەیە لەقسەکانماندا نابێت لەبیری بکەین، لەتەوەری پێشوتریشدا کەقسەمان کرد قسە لەوە دەکرا کە بۆ مەکتەبی سیاسی بانگی ناکات، یان مەکتەبی سیاسی و فلان و فیسار وادەکەن، یان بۆ فلان ناگۆڕێ و فلان بێنێت؟ ئەوەش کاك نەوشیروان زۆر ورد بو لەوەی کە تەقدیری دەکەیت پێی دەڵێیت بڕۆرەماڵەوە.

گەندەڵی ئیرادەیە، چاکسازی ئیرادەیە یان نا، من پێم وانیە ئیرادەی چاکسازی هەیە، ئیرادەی چاکسازی بەو مانایە نا کەبرادەران لە سەرەوە دەیانەوێت بیکەن، یان هەندێك دەیانەوێت چاکسازی بکەن، یان بەو جۆرە نا بیەوێت چاکسازی بکات خۆی نەگرێتەوە، بۆیە پێم وایە ئیرادەی چاکسازی، دەبێت ئیرادەیەك بێت لەخوارەوە، ئێمە قسەمان لە هەمو میکانیزمەکان کرد، بەڵام باسی خوارەوەمان نەکرد، واتە لەکاتێکدا کەتۆ حیزبێکت هەیە ئەم حیزبە پێکدێت لەکۆمەڵێك کەس لە سەرەوەو خەڵکت هەیە لەخوارەوە، لەنێوان ئەم بنکەیە لەخوارەوە کەبەیەکجاری لە سەرکردایەتیەکەی دابڕاوەو لەنێوان ئەم دو لایەنەدا شتێکی دیکە نیە، یەکێك نیە بەم سەرکردایەتیە بڵێت بۆ وا دەکەی؟ بۆیە بەڕای من کەموکوڕیی سەرەکی کە مەسەلەکانی گەیاندوەتە ئەم ئاستەی ئێستا، لەوێدایە، لەناو دەوڵەتدا کەئۆپۆزسیۆن نەبوەو پەرلەمانێکی کارات نەبو، ئاساییەو بەسروشتی تاکڕەوی پەیدادەبێت، ئەوکاتە کەس نیە لەزیادەڕەوی و گەندەڵی بپرسێتەوە، لەناو حیزبدا کەئۆپۆزسیۆن نیە، کەنەوەی دوای سەرکردایەتی کەسەرکردایەتی کورد بەحیزبەکانی تریشەوە کەرەنگە یەکێتی لەهەندێکیان باشتر بوبێت، بەپرۆسەیەکی مەبەستدار توانی گیانی کادری ناوەنجی بکوژێت، توانی رەوشێك بێنێتە کایەوە ئەو جۆرە کادیرە نەمێنێتەوە، ئەو کادیرەی کە بەبەردەوامی رۆڵی ئۆپۆزسیۆن دەگێڕێت لەنێوان خوارەوەو سەرەوەدا دەتوانیت بیکەیت بەپارێزەری پەیڕەوی ناوخۆ، دەتوانیت بیکەیت بەپارێزەری یاساو دەستور لەناو حیزبدا ئەوە دەتوانیت لە سەرکردایەتی بپرسێتەوەو فشاری بنکەی جەماوەریی لە سەر زیادبکات و ئەوە پەیوەندیی لەگەڵ جەماوەردا هەیەو دەتوانێت لەکۆنگرەدا لێپرسینەوە لەگەڵ سەرکردایەتی بکات، ئەمەمان کوشت، کە ئەمە کوژرا ئیتر تۆ دەرفەتی ئەوەت نەهێشتەوە، نەفەسی تر نامێنێت کە ئەوە رێبازێکە هەمو سیستمە شمولیەکان لەوێدا یەکدەگرنەوە، کاتێکیش کەخۆیان دەکەونە بەرمەترسی کەسێك نیە مەترسی بخاتە سەر دەسەڵاتەکەیان، لەناو ئەم حیزبانەشدا کەتۆ نەفەسی کادر ناهێڵیت، لێرەوەیە دەبێت پرسیاری سەرەکیمان ئەوە نەبێت بیروڕا گرنگە، پرۆژە گرنگە، هێنانی پسپۆڕیش لەدەرەوە گرنگە، بەڵام ئێمە دەتوانین ئەو پسپۆڕانە بهێنین بەو جۆرە جێبەجێی بکەین کەخۆمان

دەمانەوێت، هیچ سیفەتێك و رۆڵێکی ئیلزامی نیە ناچارمان بکات ئەوە بکات یان ئەمە بکات، ئێمە دەتوانین بێین ئەوە بکەین و فێڵیشی تیابکەین، بەڵام ئەوەی کە دەتوانێ چاکسازی بکات، خۆتی، ئەگەر خۆت بڕیارت دابو، دەیکەی.

- نەوشیروان مستەفا: من پێم خۆشە مەسەلەیەکت بۆ رون بکەمەوە، دونمونەت بۆ دەهێنمەوە لەپرۆژەکەی کاك عیمادو ئەواندا تیایەتی دەڵێت حیزب و حکومەت لەیەکتری جیابکەینەوە، چۆن لەیەکتربیان جیادەکەیتەوە؟ دەبێ یەکێك بێت پێتبڵێت، ئێستا ئێمە لەبەردەم تێکەڵاوکردنەوەی حکومەتداین هیچ ئەزمونێکی ئەوەمان نیە کە دو وەزارەت چۆن تێکەڵاودەکرێتەوە، دەبێ لەیەکێك بپرسیت کە ئەم دو وەزارەتە چۆن تێکەڵاودەکەیتەوە؟ ئالیەتی پرۆسەکە دیاری نەکراوە، لەوانەیە یارمەتیمان بدەن لەدۆزینەوەی ئالیەتەکەو چارەسەرەکەیت پێبڵێت.

- سەردار عەبدوڵڵا: کاك نەوشیروان من ١٠٠٪ لەگەڵ ئەوەم سودوەرگرتن لەشارەزایان زۆر کارێکی باشە، من لەگەڵ داخراندا نیم، لەگەڵ ئەوەدام لە هەمو بوارێکدا شارەزای بێگانەمان هەبێت و شتەکانمان پێ بڵێن، بەڵام قسەم لەوەیە کە ئێمە زۆر زیرەکین لەوەی خۆمان بدزینەوە لەو ئیلتیزاماتەی لە سەرمانە، ئەمە ئەگەر ئیرادەی چاکسازی نەبێت، ئیرادەی چاکسازیش مەسەلەیەکە پەیوەندی بەخوارەوە هەیە، کێشەکە ئەوەیە، ئەوەی تائێستا قسە لە سەر چاکسازی دەکات، ئێوە خۆتانن.

- نەوشیروان مستەفا: ئەوە راست نیە کاك سەردار بمبورە مەسەلەی چاکسازی لەبنەڕەتدا لەبنکەی جەماورەیی یەکێتیەوە هاتوە، ئەو بنکە جەماوەرییە سودمەندترین کەس دەبن لەچاکسازی، چونکە بنکەی یەکێتی ئەندامە سادەکانی یەکێتین، وەکو هاوڵاتی ئاسایی دەژین، کارەبا نەبێت کارەبای نیە، نەوت و بەزین نەبێت نیەتی، موچە نەبێت موچەی نیە، ئەوەی لەناو یەکێتی و حکومەتدا سودمەندە بەژمارە هەزار کەسن، جگە لەهەزار کەسەکە باقیەکەی تری وەکو هاوڵاتی ئاسایی دەژی، لەبەرئەوە لەگەڵ چاککردندایە، لەگەڵ گۆڕاندایە.

- سەردار عەبدوڵڵا: بێگومان چاکسازی لەبەرژەوەندی بنکەکەیە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە ئەو بنکەیە نەبوە بەئیرادەیەك و ئەو ئیرادەیە نەخوێندراوەتەوە، بۆیە من پێم وایە ئەگەر پرۆژەیەکی چاکسازی هەبێت و بکرێت متمانەیەکی زۆرترو

بۆچونێكی جیاوازتری هەبێت و دەستنیشان كردنی وردتری هەبێت بۆ كێشەكانی خوارەوە، ئەوە كادیرە، لێرە ئەوەندەم گلەیی لە سەركردایەتی هەیە كە بەدرێژایی ١٥ ساڵی رابردو پرۆسەیەكی سەركەوتو بوە بۆ پەراوێزخستنی كادیرو بێ ئیرادەكردنی كادیر، بەشی دوەمی گلەییەكەم لەكادیر خۆیەتی ئەم هەمو بێنەو بەردەیە هەیە كەچی كەمترین كادیری یەكێتی و حیزبەكان رۆڵیان هەیە كەقسە لەم مەسەلانە بكەن، كەمترین رۆڵیان هەیە، دەنا قسەم لە سەر ئەوە نیە كە سودمەند نابێت.

- نەوشیروان مستەفا: نەخێر زۆریش قسە دەكەن، نازانم جەنابت تا چەند بەشداری دەكەیت لەو كۆبونەوانەی ئێمە لەگەڵیان دەكەین، هەمو ئەو كادرانەی كۆبونەوەیان لەگەڵدا دەكەین بەچاك و خراپ بەوەی سودمەندە یان ناسودمەند لە سەرتاسەری یەكێتیدا لەوپەڕی بادینانەوە تا دەگاتە لای كفری و خانەقین و كۆبونەوەیان لەگەڵدا دەكەین، هەمو پێ لە سەر ئەوە دادەگرن كەیەكێتی و حكومەت پێویستیان بەچاككردنەو چاكسازی پێویستەو ئەگەر نەیكەین ئەنجاممان باش نابێت، كەسێك نیە كەنەیڵێت، بەڵام پێویستی بەوە هەیە كەبەرنامەیەكی بخەیتە بەردەم كە چی بكات، تۆ ناتوانیت داوا لەئەندامێكی سادە بكەیت ئەو پرۆژەی گۆڕینی یەكێتیت بداتێ، پرۆژەی گۆڕینی یەكێتی یان دەبێت لە سەركردایەتیەوە دەربچێت یان دەبێت لەناو باڵێكی یەكێتیەوە دەربچێت، ئەگینا ئەندامێكی سادەی ناو یەكێتی ئەو كەسە نیە كەپرۆژەیەكی گەڵاڵەكراوی پەیڕەوی ناوخۆ یان پرۆگرامی چاككردنی حكومەت پێشكەش بكات، ئەوەیان ئیشی شارەزایەكە، یان ئیشی نوخبەی ناو یەكێتیە.

- سەردار عەبدوڵڵا: ببورە كاك نەوشیروان، بەڵام ئێستا قسەكردن لە سەر گەندەڵی و چاكسازی بوە بە دیاردە، بەداخەوە ئەوانەی خۆشیان بەشێكن لەو گەندەڵیە، ئەوان ئەو قسانە دەكەن، هەندێ جار رەنگە ئێمە دەرەقەتیان نەیەین قسە بكەین، ئەو زیاتر موزایەدە دەكات لەو مەسەلەیەو بوە بەدیاردە هەمو كەس قسەدەكات، بەڵام كێشەكە لە كوێدایە؟ لەوەدایە كەمن قسە لەبنكە دەكەم وەك رۆڵی بنكە، مەبەستم لە ئەندامی سادە نیە بەتەنیا، قسەم لەو نوخبەیەیە كەكادرە لەناوەڕاست كە گوشراوە، كە كوژراوەو روحی تیانەماوەو روحی ئەوەی تیانیە بێت بڵێت كاكە ئەوە ١٥ ساڵتان تێپەڕاند ئیتر بەسە، ئیتر هیچ

نەبێت لە سەرکردایەتیش بێت سەرەی منە، ئەم گیانە نەماوە، ئەم گیانی مونافەسەیە لەخوارەوە کەپێی دەوترێت ململانێی نەوەکان.

**بەهرۆز عەلی: قسەمان لە سەر ئەوە بو بۆ چاکسازی چیتر لەو پرۆژەیەدا جێی بکرێتەوە، یان چ بیروبۆچونێکی تر دەربارەی هەیە؟**

- کاوە محەمەد: لەم ماوەیەدا کۆمەڵێك پرۆژە خراونەتەڕو، بەلام مەسەلەی باسکردنی چاکسازی و نوێبونەوە ئەوە دەمێکە لەناو یەکێتیدا باس دەکرێت و لەناو بنکەی جەماوەری و کادرانی پێشکەوتو زۆر بەجدی باسکراوە پێش ئەوەی لەمەکتەبی سیاسی بخرێتەڕو، بەشێوەیەك لەشێوەکان بە بەربڵاوی باسکراوە لەخوارەوەو گۆڕین زۆر بەپێویست دەزانن، ئەمجارە بەڕای من ئەوەی کە هاتوەتە پێشەوە، بەرگرتنە لەتەشەنەسەندنی ناکۆکیەکانی ناو یەکێتی و ناو حیزب، نەك پرۆژەیەکی موتەکامیل بێت کەحیزب بیەوێت خۆی نوێ بکاتەوە، بەڕاستی هەمو ئاگاداری ئەو وردەکاریانەین کەناکۆکی هەیە لەبیرورا، لەکۆمەڵێك بەرژەوەندی لەنێوان برادەران، ئەو مەسەلەیە گەیشتوەتە سنورێك کەتەواو هاتوەتە خوارەوەو لەناو کادران و بنکەی جەماوەری نەخشی خۆی داناوە، ئەو پرۆژەیەی دواییش کەبرادەران خستیانەڕو، بەبۆچونی من ئەوەندەی هەندێك بیرۆکەن بۆ ئاشتبونەوە، ئەوەندە پرۆژەیەك نین بۆ چاکسازی بەڵام پێویستە لە هەمان کاتدا تەوافوقێك هەبێت لەناو سەرکردایەتی ی.ن.ك، چونکە تۆ بەبێ ئەو تەوافوقە ناتوانیت پرۆژەیەك گەڵاڵە بکەیت بۆ چاکسازی لەناو ئەو حیزبەدا، من زۆر خۆشحاڵ دەبم کە ئەگەر وەك کاك نەوشیروان دەڵێ لە سەر ئەوە وەستاوین کەوا کۆمەڵێك شارەزا بێن کە ئەو شتانەمان پێ بڵێن، بەڵام بەمەرجێك ئێمە ئیرادەکەمان هەبێت، راستە ئەوە شتێکی باشە و سودیان لێوەربگرین، بەڵام مەسەلەی ئەو وردەکاری و ئاڵۆزیانەی کە لەناوخۆمان هەیە، ئەوە شارەزای دەرەکی ناوێت، بەڵکو ئیرادەی خۆمانی دەوێت.

**بەهرۆز عەلی: ئایا میکانیزم هەیە بۆ ئەوەی ئەگەر پرۆژەیەک گەڵاڵە کرا، کاری لە سەر بکرێت؟**

- عیماد ئەحمەد: ئەگەر قسەی لە سەر بکەین، ئایا چاکسازی

لەحیزبەوە دەستپێبکەین و ئینجا بچین بۆ دامەزراوەکانی تر، یان لەیەك کاتدا چاکسازی لە هەمو دامودەزگاکان لەیەك کاتدا بکەین؟ ئایا کە حیزب چاك بو، دامەزراوەکانی تریش چاك دەبن؟ یان لەیەك کاتدا هەم حکومەت و هەم دەزگاکانی تری ناو کۆمەڵگەو دەزگاکانی کۆمەڵي مەدەنی چاك بکەین لەگەڵ حیزبدا؟ مەسەلەی چاکسازی کەهەیە هەمو هاوڕاین لە سەری، بەڵام شێوەکەی لەوانەیە لەمنەوە بۆ تۆ جیاوازیی هەبێت، ئەو دەیەوێت بەجۆرێك چاکسازی بکەیت، من بەجۆرێکی تر، هەمومان چاکسازیمان دەوێت، بەڵام بەجێبەجێکردنەکەی ناکۆکی دەبێت لەنێوانماندا، لەوێشدا دەبێت خاڵی هاوبەش دروستبکەین، یەك خاڵ هەیە کە نابێت ئێمە غەدر لەیەکێتی بکەین، یەکێتی ئازادیەکي زۆری داوە، ئەمەی کەئێمە قسەی لە سەر دەکەین هیچ حیزبێك ئەمە ناکات، جێگری سکرتێری گشتی و سەرکردەیەکی پلەیەکی یەکێتی لەگەڵ رۆژنامەنوسان دانیشین و لەتەلەفزیۆن عەیب و عارەکانی خۆمان باس بکەین، پار لەیادی یەکێتی هەمان شتمان کردوە، بڕۆ لەرۆژنامەکان چ قسەیەکی لە سەردەکەین، لە سەرتاسەری کۆبونەوەکان هەریەك لەکادرەکان بۆیان هەیە قسە بکەن، بەڵام ئایا ئەو قسەیە چەند بردەکات؟ ئەوە جێگای قسەکردنە، بەڵام بوترێت خەفەکراون و رۆڵیان پێنەدراوەو هیچ ئازادیەك نەدراوە، بەڕاستی ئەوە غەدرە، هەر ئەم بەرنامەیە بۆخۆی نمونەیەکە خۆ لەوانەیە ناکۆکی و جیاوازیی لەنێوان من و کاك سەردار هەبێت و ئەمە حاڵەتێکە بەتەندروستی دەزانم و سروشتیەو بەشێکە لەشەفافیەت، بەڵام بڵێین نەبوە ئەوە غەدرێکە لەمێژوی خۆمانی دەکەین، لە سەروەریەکانی خۆمانی دەکەین، هەرچەندە رۆڵی ئەوە نەماوە هەر سەروەری پێشتر بخەینە بەرچاو بەڵکو دەبێت شتی دیکەش پێشکەش بکەین، بەڵام هەر شتەو مافی خۆی بدەینێ.

**بەهرۆز عەلی: دوایین تەوەرمان قسەکردنمان بو لە سەر بیرۆکەی چاکسازی، ئێستا دێینە سەر پرسیار لە سەر ئەوەی تا چەند زەمینەی لەبار هەیە بۆ چاکسازی؟**

- نەوشیروان مستەفا: من سەرەتا گرفتم لەوەدایە کەئێوە ئەتانەوێت چی چاك بکەن، ئێستا ئێمە وەزعێکمان هەیە حکومەتمان هەیەو یەکێتیەکمان هەیە، ئێوە وەکو کۆمەڵێك

ڕۆشنبیر دەتانەوێت چی لەم یەکێتیەو لەم حکومەتەدا بگۆرن و چاکسازی لەچیدا بکەن؟ ئەوەم بۆ دیاری بکەن ئینجا دێمە سەرئەوەی کەچۆن چاکی دەکەین و میکانیزمی چاکسازی چییە، تا ئێوارە پێم دەڵێی حیزبەکەت گەندەڵی تیایە پێم نەڵێی گەندەڵی لەچیدایە دەبێت، دیاری بکەیت، دەبێ خاڵ بەخاڵ بۆم دیاری بکەیت بۆئەوەی کەچاکی بکەم.

هەندێك قسە وەك دروشمی قۆناغەکەی لێدێت، یان وەك دروشمی باوی لێدێت، سەردەمێك باو باوی ئەوە بو باسی عەولەمەیان دەکرد، سەردەمێك باسی کۆمەڵگەی مەدەنیان دەکرد، بێگومان هەندێکیان نەشیان دەزانی کۆمەڵگەی مەدەنی چیە، ئێستاش باو باوی فەسادی ئیداری و مالیە، دەبێت دانیشین وردی بکەینەوە بزانین گەندەڵی ئیداری چیە، گەندەڵی دارایی چیە، گەندەڵی سیاسی چیە، وەکو دیاردە، خوێندنەوەی بۆ بکەین و شیبکەینەوە کە ئەو دیاردەیە چۆن ڕەنگی داوەتەوە لەناو حکومەتەکەمان و حیزبەکەماندا بۆئەوەی چارەسەری بکەین، ئەو پرۆژەیەی کە ئەو برادەرانەش پێشکەشیان کردوە، بەگشتی بیرۆکەی گشتیە، هیچ شتێکی وردیان دەستنیشان نەکردوە، بۆنمونە باسی ئەوە دەکات کە دەسەڵاتی حکومەت لەدەسەڵاتی حیزب جیابکرێتەوە، مەبەستی چیە کە دەسەڵاتی حیزب لەحکومەت جیابکرێتەوە، ئێستا ئەمجارەش ئێمە حکومەتێکی هاوبەش لەگەڵ پارتیدا پێکدەهێنین، ئەو کاندیدانەی کە بەتەماین دایانبنێین هەمویان حیزبین، نەك هەر حیزبین هەموشیان سەرکردەن لەحیزبەکەدا، بەڕێوەرە گشتیەکان بەتەماین هەمو ئەوانە بن کەحیزبی بن، ئەمە جیاکردنەوەی حیزبە لەحکومەت یان تۆ کادر دەدەیت بەحکومەت ئیتر تەدەخول لەئیشیدا ناکەیت یان هەمو ڕۆژێك نامەیەکی بۆ دەنێریت فلانم بۆ دامەزرێنەو پارە بدە بەفلان کەس و زەوی بدە بەفلان، دەبێت شتێك بدۆزینەوە کەچۆن ئەمە جیادەکەیتەوە، ئایا کەموکوڕی لەوەدایە کەحیزب و حکومەت تێکەڵاوبوە، دەست لەکاروباری یەکتری وەردەدەن؟ سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژیش بەهەمان شێوە پرۆژەیەکیان هەیە، پرۆژەیەکی زۆر باشەو بیرۆکەی زۆر باشی تێدایە، کاك ئاواتی شێخ جەناب یش پرۆژەیەکی ناردوە ئەویش بیرۆکەی باشی تێدایە.'

کۆمەڵێك خەڵك وتاریان نوسیوەو لەڕۆژنامەکانی وەك

کوردستانی نوێ و هاوڵاتی بڵاویان کردوەتەوە، یان لەسایتەکاندا نوسیویانە، بەڵام ئەوانە پێویستیان بەوردکردنەوە هەیە.

**بەهرۆز عەلی: زەمینە هەیە بۆئەوەی جێبەجێ بکرێت؟**

- نەوشیروان مستەفا: بەڵێ من پێم وایە یەکێک لەو هۆکارانەی کەئێستا هەمو کەس دەتوانێت لەهەرێمەکەی ئێمەش و لەهەرێمەکەی ئەولاشدا دەتوانێت باسی ئەوە بکات بڵێت دەبێت چاکسازی بکرێت و گەندەڵی هەیە، ئەوەیە کە ئێمە سەردەقەکەیمان شکاندوە، سەردەمێك بەحکومەتت بگوتایە گەندەڵی هەیە لەوانە بو بەندت بکەن، بۆیە من لێرەدا دەمەوێت لە سنوری دروشم بچێتە دەرەوەو وردی بکەینەوە.

بۆنمونە بۆ لەمەودوا نەك لە سەر بنەمای حیزبایەتی و مەحسوبیەت و دەستەو تەکەتول خەڵك کاندید بکەین بۆ پۆستەکان، بەڵکو لێهاتویی و هەندێك پێودانگی کارگێڕی و یاسایی بکرێت بە بنەما.

بۆ نمونە کاك بەهرۆز کاندید دەکرێت بۆ بەڕێوەبەری گشتی، ئەو پۆستە هەندێك مەرج و یاسای هەیە کە ئەوەندە ساڵ خزمەتی هەبێت، لەبواری کارەکەیدا پسپۆربێت، بەفلان پلەدا رۆیشتبێت، بۆنمونە مامۆستا دەبینێت کەسێك هەیە دو ساڵە خوێندنی تەواوکردوە، کەسێك هەیە لە هەمان خوێندنگە ٢٥ ساڵە مامۆستایە، ئەوەی کە ٢ ساڵە مامۆستایە لەبەر ماستاوکردن و لەبەر حیزبایەتی دێت واسیتە بە من دەکات، من بە زۆر دەیسەپێنم و دەیکەم بە بەڕێوەبەر لەو قوتابخانەیەی کە مامۆستایە لێی، ئەوەی کە ٢٥ ساڵ وانەی وتوەتەوە دڵی دەشکێت، تەماشا دەکات دادپەروەری تێدا نیە.

جا دادپەروەری نە لە دابەشکردنی زەویدا هەیە، نە لە دابەشکردنی وەزیفەدا هەیە، نە لە دابەشکردنی پارەدا هەیە، نە لەدابەشکردنی سەفەردا هەیە، دەبێت ئەوە چارەسەربکرێت چۆن چارەسەردەکرێت ئەوە من نایزانم من لەوەزیفەدا نەبوم.

وەکو حیزبیش ئێمە چاومان لەحکومەت کردوە، هەندێك لە لێپرسراوەکانمان وەك ئەو برادەرانە باسیان کرد، لە رێی حکومەتەوە دەوڵەمەند بون، پێشی وایە پلەی حیزبی هیچی کەمتر نیە لە پلەی وەزیری، بۆچی ئەو وەزیرە موچەکەی ئەوەندەیەو زەویەکەی ئەوەندەیەو ئوتۆمبێلەکانی ئەوەندەیە،

ئەوەندە پاسەوان و حیمایەی هەیە، دەبێت ئەویش هەیبێت.

**بەهرۆز عەلی: کاک عیماد وەڵامت چیە؟**

- بۆ حیزب کەدەڵێت چۆنی دەکەین، دەڵێم کۆنگرە بنەمایە، زەمینەخۆشکردن بۆ کۆنگرە بنەمایە، وەکو خۆشمان ئیرادەی ئیشەکە بنەمایە، وەکو کاک نەوشیروانیش باسی کرد هەر ناڵێم لەخۆمان لە قاعیدەش، چونکە هەر کۆنگرە ئەم سەرکردایەتیەی هەڵبژارد، هەر ئەو بنکە جەماوەریەی حیزب بو ئەم سەرکردایەتیەی هەڵبژارد، خۆ لە ئاسمانەوە سەرکردایەتیەکە دانەبەزیوە.

نەوشیروان مستەفا: من زۆر بەلامەوە گرنگە ئێوە بۆمان دیاری بکەن کە دەتانەوێت گۆڕان لە چیدا بکەن؟ چاکسازی لەچیدا بکەن، دووەم میکانیزمی گۆڕانەکە چۆن بێت، چونکە یەکێك لەو هۆکارانەی کە کودەتای سەربازیی دروست بوە لە وڵاتاندا، یان شۆڕشی چەکدار دروست بوە ئەوەیە کە ڕێگەی گۆڕینی هێمنانە نیە، کاتێك لە وڵاتێکدا دەگەیتە ئەو بڕوایەی کە نائومێد دەبیت و ناتوانیت بە هەڵبژاردن بە ڕێگەی خۆپیشاندان بە یاخیبونی مەدەنیانە گۆڕین لەرەوشەکەدا بەدی بهێنیت و چاکسازی بکەیت و دەستاودەستی دەسەلات بە ئاشتیانە بکەیت، ئەوکاتە پەنا دەبەیتە بەر کودەتای سەربازی، یان خەباتی پارتیزانی کە کاتی خۆی ئێمە کردومانە.

واتە میکانیزمی ئەو گۆڕینە چیە، چۆن لەناو یەکێتیدا دەتوانیت ئەو کەموکوڕیانە چارەسەربکەیت و چاکسازی بکەیت؟ چۆن لەناو حکومەتدا دەتوانیت چاکسازی بکەیت و بەچ ڕێگەیەك دەکرێت، پێم وایە ئەمە گرنگترین مەسەلەیە کە ئێوە ئەمجارەش نەبێت جاری تر باسی بکەن، چونکە هەرچەندە ئێوە باسی بکەن، ئەگەر ئێمە ئیرادەی گۆڕینمان نەبێت و فشارێکمان لە سەر نەبێت، هیچ ناگۆڕن، ئەگەر حیزبەکەشمان چاککرد، دەتوانین حکومەتەکەشمان چاك بکەین، تا حیزبەکە چاك نەکەین، نە حکومەتەکەمان پێ چاك دەکرێت، نە ڕێکخراوە دیموکراتیەکانمان پێ چاك دەکرێت، نەمیدیامان پێ چاك دەکرێت و هیچ شتێکمان پێ چاك ناکرێت.

**بەهرۆز عەلی: کەواتە زەرورەتی سەرەکی ئەوەیە کە سەرلەنوێ**

**هەیکەلی حیزب بونیاد بنرێتەوەو ئەو ئۆرگانانەی کە هەیەتی رێک بخرێتەوە بە جۆرێک کە بگونجێت لەگەڵ رەنگ و روی ئەم سەردەمەدا؟**

عارف قوربانی: من بە پرسیارێك دەستپێدەکەم، ئایا نیەت هەیە بۆ ئەوەی حیزبەکە چاك بکەین لەناو سەرکردایەتی یەکێتیدا؟ چونکە قسەو پرۆژە جێیان لەنیەتی کارکردن، وەك ئەوەی خۆی باسیکرد نەك بە تەنها قسە هەیە لە سەر چاکسازی، خەریکە دەبێتە فشار، دڵنیام رۆژێك دێت رەنگە سەرکردایەتیەکەی ملکەچ بکات بۆ شتی ترو چیتر لەم سەرکردایەتیەی قبوڵ نەکات.

من راشکاوانە دەیڵێم، بەگومانم لەوەی کە لەناو سەرکردایەتی سیاسی ئێمەدا کە بنەمایەك هەبێت هەمومان کۆك بین لە سەری و بچین حیزبەکەمان چاك بکەین، لەم سێ ساڵەدا چەند هەنگاو دەنێین کە بچین حیزبەکەمان چاك بکەین، لەبەرامبەر ئەوەشدا هەست دەکەین هەر لە سەرکردایەتی خۆمانەوە پێچەوانەی ئەو ئاراستەیە کاردەکات، بۆیە من پێم وایە زەمینەی لەبار نیەو رێگریی لە بەردەم زەمینەکە دێتە پێش، زەمینەکە دو جار رێگریی دێتەپێش، جارێکیان لەناو سەرکردایەتی خۆماندا خەڵك هەیە کە رێگرە لە بەردەم چاکسازی و سود لەو رەوشە دەبینێت و تا یەکێتی بەرەو خراپتر بچێت لە بەرژەوەندیی ئەودا دەبێت، ئێمەش وەك خۆمان دەبێت دەستنیشانی بکەین و هەوڵبدەین قسە لە سەر چاکسازیی حیزب بکەین، چونکە ئێمە توشی قەیرانێکی دیکە دەبین لەم پرۆسەی چاکسازیەدا، پێشتر هەندێك برادەر پێیان وابو کە هەردو پرۆسەی چاکسازی حکومەت و حیزب پێکەوە دەست پێبکەین، ئێمە حکومەت تێکەڵ دەکەینەوە، بۆیە نابێت ئەم حکومەتە لایەکی ئێمە بمانەوێت چاکی بکەین و لایەکی شەلەل بێت، بۆیە پێویستە حیزبەکەی خۆمان چاك بکەین، چۆن حیزبەکە چاك بکەین، ئەوە ئەو پرسیارەیە کەسەرکردایەتی ئێمە بەکردەوە هەڵوێستی خۆی رابگەیەنێت کە ئایا سەرکردایەتی ی.ن.ك دەیەوێت یەکێتی چاك بکەین، کە دەشڵێم سەرکردایەتی، دەزانم دەنگی باش هەیە لەناو سەرکردایەتی و شەرێتی لە سەر ئەوەی یەکێتی چاك بکرێت، کۆدەنگییەك هەیە لە سەری؟

نەوشیروان مستەفا: من لەلای خۆمەوە هەیەو لەلای خەڵکی تریشەوە برۆ لەخۆیان بپرسە، دڵنیانیم کۆدەنگی هەبێت هەندێك هەیە بەهیچ جۆرێك گۆڕینی بەکردەوە ناوێت، بەڵام بەقسە

لەگەڵ گۆڕپینداپە.
لاوەند نەوزاد: هیچ کۆدەنگییەك نییە، هیچ کۆدەنگییەکیش نابێت، چونکە کۆمەڵێك کەس بەرژەوەندییان هەیە، دەست لەو بەرژەوەندییانە بەرنادەن، کەواتە دەبێت حیزب خۆی یەکلایی بکاتەوە، حیزب دەبێت حیزب بێت و کۆمپانیای بازرگانی نەبێت بۆ ئەندامەکانی، دەبێت حیزب بێت بۆ پرۆسەیەکی سیاسی.

**بەهرۆز عەلی: کاک عیماد زەمینەو میکانیزمێکی لەبار هەیە بۆ چاکسازی؟**
عیماد ئەحمەد: زەمینەی لەبار هەیە، زەمینە لەناو بنکەی جەماوەریی هەیە، لەناو خەڵك هەیە، ئەگەر سەیری کێشەکانی کەلار بکەین، سەیری ئەو ماوەیە بکە بێزارییەك هەبو چ لەدەسەڵات، چ لەخۆمان، بێزارییەکەش ئەوەندەی لە سەر سەرکردەکان بو، ئەوەندە لە سەر شتی دیکە نەبو، دوەم دوای ئەم هەڵبژاردنە کە ئەنجام درا، خەڵك پاسێکی دیکەیان دایە لایەنە سیاسیەکان، وتیان پاش ئەمە داوای چاکسازیتان لێدەکەین و لێتان قبوڵ ناکەین بەو شێوەیە، کەواتە زەمینەیەك هەیە بۆ چاکسازی، واقیعێك هەیە بۆ چاکسازی جا چۆن دەیکەیت، بەرنامەکەی چییە، میکانیزم چییە، لەوەدا جیاوازی هەیەو لەوانەیە لەناو یەکێتیدا هەمو کەسێك رای وەك یەك نەبێت و ئەوە بەرژەوەندیی دیاریی دەکات.

**بەهرۆز عەلی: کاک سەردار رای تۆ لەو بارەیەوە؟**
سەردار عەبدوڵڵا: زەمینە هەیەو دەبێت ورد بڕوانین ئەگەر پرۆسەی چاکسازی ئەگەر بەوردیی نەکرێت، دەکرێت دەرەنجامی خراپی لێ بکەوێتەوە، واتە رەنگە پرۆسەیەکی تێکدان بێت، ئەمەم بۆ ترساندن نییە، بۆ ئەوەیە کە وەك کاك نەوشیروان وتی ئێمە وردبین لە دەستنیشانکردنی کێشەکان و دیاریکردنی چارەسەرەکان، بەڵام لێرەوە بە بڕوای من کێشەکان دەردەکەون، ئێمە لە پێناسەکردنمان بۆ گەندەڵی دەبێت هەر باس لە روکاری گەندەڵیی نەکەین بەڵکو دەبێت لەرۆح و ناوەرۆکی گەندەڵیش قسە بکەین کە پەیوەستە بە دواکەوتنی کۆمەڵایەتیشەوە، پێم وایە یەکێك لە کێشە هەرە جەوهەرییەکانی ئەوەیە کە پاش ئەو سەردەقەی برادەران شکاندیان و ئێستا هەمو کەسێك قسە دەکات،

که ئەوە بێگومان دەستکەوتە، بەڵام ئیتر بە تەنیا قسەکردن و قسەکردن ئەمە هاوبەشیکردن نیە، یەکێك لە کەموکوڕیەکان بەوە دەبینم کە پرۆسەی چاکسازی لەناو یەکێتی لە حیزبەوە دەست پێ دەکات و ئەو دەزگا پەککەوتوانەی کە هەن و ناتوانن لەگەڵ سەردەمەکەدا رێ بکەن، زۆربەی دەزگاکانی هی حیزبی شمولین و بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگەن بە دیوێکی تردا پارەی حکومەت دەچێتە ئەوێ، پارەی حکومەت دەچێتە مەکتەبێکی یەکێتی، لەمەکتەبەکەی یەکێتیەوە دەبێت دەزگایەکی کۆمەڵی مەدەنی وەریبگرێتەوە، ناچێت راستەوخۆ لە حکومەتی وەربگرێت، لێرەوە ئەگەر بتەوێت دەست بە چاککردنی حیزب بکەیت، پێش هەمو شتێك ئیرادەی چاکسازی گرنگە، دوەم ئەو ئیرادەیە دەبێت ئیرادەیەکی خوارەوە بێت و ناکرێت هەر قسەی گشتی بێت، من ئەوە بە ئیرادە نازانم کە ئێمە تەنفیس دەکەین، ئیرادە ئەوەیە کە دەبێت هێزی فشارو چاکسازی دەبێتە شتێك بونی هەیە، من ئەگەر رەخنەیەکم لەو برادەرانە ئەوە بێت کە بەم دواییانە ئەو پرۆژەیەیان خستەڕو، لێرەشەوە دەڵێم پرۆژەی چاکسازی لەناو یەکێتی پرۆژەیەکە دەبێت حسابی رەوشی ناو یەکێتیش بکات، دەبێت پرۆسەیەك بێت بەشێنەیی تێپەڕێت، دەبێت بە عەقڵ و لۆژیك بڕوات، دەبێت پرۆسەیەك بێت پەنا نەباتە بەر دروشم و هەڵچون و داچون، ئەمەش پێویستی بەکاری عەقلانی هەیە، یان ئەوە رەنگە رەخنەیەك بێت ئاراستەی ئەو برادەرانەی بکەین کەپرۆژە دادەنێن لە سەرکردایەتی رەنگە ئەوەی پێشوتر کە برادەرانی مەکتەبی سیاسی خستیانە ڕو گفتوگۆیان لەگەڵ هەندێك کادیر کردبێت، دواتر هەر ناوی خۆیانی لە سەربو، یان کاك عیمادو برادەران کە پرۆژەیان ئامادەکردبو، بڵاویشیان نەکردەوەو قسەمان لەقەیرانی شەفافیەت کرد، کە زۆر درەنگ بڵاویان کردەوەو من خۆم کە چەند نزیکم، زۆر درەنگ زانیم، تا بڵاونەکرایەوە نەمزانی، کێشەکە ئا لێرەوەیە، من پێم وایە چاکسازی بەشێکی پەیوەندی بەوەوە هەیە کە سەرکردایەتی دەیکات، من لەگەڵ ئەوەشدا نیم کەبڵێم نابێت سەرکردایەتی رۆڵی لەم مەسەلەیەدا هەبێت، بەڵام دەبێت بنکەی جەماوەری بەتایبەتی کادیری ناوەنجی رۆڵی لەم مەسەلەیەدا هەبێت و کادیر نەبێت بەشەریکی بەکردەوە لە پرۆسەی چاکسازیدا دیسانەوەی ئەوانەی لە سەرکردایەتیدا چاکسازی لە بەرژەوەندیاندا نیە،

ناهێڵن بکرێت و لێرەوە چاکسازی و ئیرادەی چاکسازی بەرجەستە نابێت.

کاوە محەمەد: بە ڕای من زەمینە هەیە، بەڵام گرنگە ئیرادە هەبێت، بەڵام پێم وایە هێشتا ئیرادەی دەستەجەمعی دروست نەبوە، رەنگە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکی دیاریکراو هەبێت، بەڵام بەو ئاراستەیە دەڕوات کە پرۆژەیەك بۆ گۆڕانی لێبکەوێتەوە، پێم وایە یەکێك لەخاڵە جەوهەریەکان ئەوەیە کە حیزب پێویستە خۆی نوێ بکاتەوە، کاك نەوشیروان پرسیاری ئەوەی کرد کە دەبێت ئێوە دەستنیشانی ئەو خاڵانە بکەن کە پێویستە ئێمە بیگۆڕین، حیزب خۆی لەخۆیدا تا ئێستا نەیتوانیوە کۆنگرەیەك بکاتەوە لەدوای کۆنگرەی دوەمەوە، بۆ نەیکردوە، مەسەلەکەش ئەوەیە لەناو یەکێتی رەوشێك هەیە ئامادەیی ئەوەی تێدانیە کە بێت کۆنگرەیەکی تر بکاتەوە، بۆ؟ ئەوە دەبێت پرسیارێکی جەوهەری بێت، کەکۆنگرەیەك نەبێت، کە میکانیزمێك نەبێت بۆ ئەوەی گۆڕان هەمیشە لەناو سەرکردایەتیەکە بێتە پێشەوە، ئەو وزانەی کە هەن من لە ١٥-٢٠ ساڵیەوە هاتومەتە ناو یەکێتیەوەو برادەرێکی تر بەهەمان شێوە تا تەمەنی دەگاتە ٥٠ ساڵی نەتوانێت رۆڵێکی کارا لەناو ی.ن.ك ببینێت کە بەشداریی لە بڕیاری سیاسی ناو حیزبەکەدا بکات و کۆمەڵێك برادەر کە ئامادەییان تێدا نەبێت کە سبەی ئەگەر لەکۆنگرەش یەکێك دەنگی نەهێنا بچێت بۆ خۆی دابنیشێت و ڕێزی لێ بگیرێت، مەرج نیە لە کۆنگرەی داهاتو ئەگەر هاتەوە هەر ببێتەوە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی، بە داخەوە ئێستا هەندێك برادەر هەیە هەمو خەبات و تێکۆشانیان هەیە، بەڵام بونەتە ئەندامی هەمیشەیی مەکتەبی سیاسی، لەحیزبی شیوعی چین ئەوە هەیە، ئەندامی هەمیشەیی مەکتەبی سیاسی، بەلام هەندێك ئەندامی ناهەمیشەیش با هەبن و بەشداریی بکەن، با ئەو ئیرادەیە هەبێت کە سبەی وتیان گۆڕدرایت، ئەوە لێدانی کەسایەتی ئەو کەسە نیە، بۆ نمونە بولند ئەجەوید لەساڵی ١٩٧٤ کە قوبرس داگیرکرا ئەو سەرۆك وەزیران بو دوای چەندین ساڵ لەچوارچێوەی بزوتنەوە دیموکراتیەکەدا هاتەوە مەیدان و بووە بەسەرۆك وەزیران و هیچ لەشەخسیەت و شوێنی ئەو کەم نەبووەوە، ئێمەش دەبێت ئەو بیرکردنەوەیەمان هەبێت لەناو حیزب و لەناو حکومەت، ئەمڕۆ وەزیرم دەڕۆم دور نیە پاش ١٠

سالّی تر داوام لێبکەنەوە ببمەوە بەوەزیر.

**بەهرۆز عەلی: لە سەر سەرجەم ئەو قسانە کاک نەوشیروان ئەگەر تێبینیەکت هەبێت؟**

نەوشیروان مستەفا: ئومێدم وایە سەرکەوتوبن و درێژەش بەکارەکانتان و بەم کۆڕو کۆبونەوانە بدەن.

**بەهرۆز عەلی: ئەی بە گۆڕینی ناو یەکێتی و حکومەت و سیستمەکەمان؟**

نەوشیروان مستەفا: دەبێت ئومێدمان هەبێت بۆ چاککردن.ی کە ئەرکەکانی خۆمان لەناو حیزبەکەی خۆمان و لەحیزبەکانی تریش و هەمو سەرکردە سیاسیەکانی ناو حیزبە سیاسیەکانی لای خۆمان، هەر ئێمە نین حیزبەکانی دیکەش بەهەمان شێوەن.

## ١٨-٤-٢٠٠٦ — (ژماره ١٥)

## رۆژنامەی ئاوێنە

# دەقی پڕۆژەی نەوشیروان مستەفا بۆ چاکسازی لەناو یەکێتی دا

**هەڤاڵانی بەڕێزی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان**

**سڵاوێکی گەرم...**

ساڵێ زیاترە چەندین وتار ئەنوسرێ و چەندین پڕۆژە ئامادە ئەکرێ بۆ چاکسازی لەناو یەکێتی و لەناو حکومەتدا، سەرەڕای ئەوەی هەمویان پڕن لە سەرەتای گشتی و ئامۆژگاری و قسەی باش و دروشم، بەڵام هیچیان بە دیاریکراوی دەستیان نەخستۆتە سەر هۆی سەرەکی پەشێوانی هەلومەرجی یەکێتی و حکومەتەکەی و هیچیان بە دیاریکراوی رێگەی چارەسەرکردنیان دانەناوە. رەنگە ئەوەش هۆی جۆراوجۆری هەبێ کە ئێرە شوێنی باسکردنیان نییە.

بەندە پاش لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنە و پاش گفتوگۆی قوڵ لەگەڵ سەدان کادری یەکێتی، هەندێك بیروبۆچونم لەلا گەڵاڵە بوە کە بە چاکم زانی بیخەمە بەرچاوی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنتان.

لێرەدا من باس لە چاکسازیی حکومەت ناکەم، چونکە کاروباری حکومەت و کاروباری حیزب پێکەوە بەستراون. دەزگا حیزبییەکان، وەزیر و وەکیلەکانیان، بەڕێوەبەری گشتی و یاریدەدەرەکانیان، بە زۆری لەسەر بنچینەی دەستەگەری و مەحسوبیەت و هەندێ

جار دابینکردنی قازانجی تایبەتی دانراون. بۆیە چاکسازی لە حکومەتدا بەندە لەسەر چاکسازی لە یەکێتیدا. هەتا پاکسازی و چاکسازی لەناو ماڵی حیزبدا نەکرێ، ناتوانرێت ناوماڵی حکومەت پاك بکرێتەوەو رێکبخرێتەوە. بۆیە من لام وایە ئەبێ ریفۆرم لە پێشەوە لە یەکێتیدا بکرێ ئینجا لە حکومەتدا.

بۆ ئەو مەبەستە بۆ رێکخستنەوەی یەکێتی سەر لە نوێ لەسەر بنچینەیەکی نوێی گونجاو لەگەڵ گۆڕانی سیاسی، کۆمەلایەتی، رۆشنبیری، ئابوری، پێشمەرگەیی... سەردەمدا پرۆژەیەکتان ئەخەمە بەردەم بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی ئازاد و سەرکەوتو، دور لە تەزویرو تەکەتول.

ئەگەر بە پەسەندتان زانی، ئەوا ئامادەم بە هەمو تواناوە بەشداربم لە شیکردنەوەی زۆرتری بەندەکانیداو لە گفتوگۆی تێرو تەسەل لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبەکاندا، هەروەها لە جێبەجێکردنیدا.

هیوادارم بە «نیازپاکی» بۆم لە قەڵەم بدەن.

**لەگەڵ رێزی** **نەوشیروان مستەفا**

**سلێمانی ٢٠٠٦/٤/١٣**

## رێکخستنی مەکتەبەکانی یەکێتی

**یەکەم: مەکتەبی رێکخستن**

١. پێکهێنانی مەڵبەند لەسەر بنچینەی دابەشکردنی ئیداری قەزاکان. واتە لەهەر قەزایەکدا یەك مەڵبەند پێکبهێنرێ.

٢. لێپرسراو و ئەندامانی کارگێری و ئەنجومەنی مەڵبەند ئەبێ دانیشتوانی ئەو قەزایە بن.

٣. لێپرسراوی مەڵبەند جێگری یەکەم و جێگری دوەمی ئەبێ.

٤. لە کاتی ئامادەنەبونی لێپرسراودا جێگری یەکەم سەرپەرشتی مەڵبەند ئەکا.

٥. کارگێری مەڵبەند بە پێی پێویستی ناوچەکەو کارەکانی مەڵبەند لە ٣-٧ ئەندام و ئەنجومەنی مەڵبەند بە پێی ژمارەی ناحیەکانی قەزاکە پێك دێ.

٦. لێپرسراوی مەڵبەند:

سەرپەرشتی چالاکییەکانی مەڵبەند ئەکا و لەبەردەم دەزگاکانی سەروتردا بەرپرسە لە کاروباری مەڵبەند.

٧. کارگێری مەڵبەند:

هەمو رۆژێ لێپرسراوی مەڵبەندو لایەنی کەم ئەندامێکی کارگێر لە بارەگای یەکێتی دەوام ئەکەن:

أ. کاروبارەکانی مەڵبەند رائەپەڕێنن.

ب. رێنماییەکانی سەرکردایەتی جێبەجێ ئەکەن.

ج. گوێ لە داواو پێشنیارەکانی ئەندامان و خەڵك ئەگرن.

٨. ئەنجومەنی مەڵبەند:

هەفتەی جارێ کۆ ئەبێتەوە بۆ:

أ. هەڵسەنگاندنی باری رێکخستن لە ناوچەکەدا.

ب. هەڵسەنگاندنی ئیشوکارەکانی دەزگا حکومیەکان: پەروەردە، تەندروستی، شارەوانی، ئاسایش، رێگەوبان.. ئەکەن.

ج. هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی سیاسی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، ئابوری ناوچەکە ئەکەن.

د. وەرگرتنی ئەندامی نوێ.

٩. کادری تەرخان موچە لە یەکێتی و فەرمانبەری حکومەت موچە لە حکومەت وەرئەگرێ.

١٠. ئەندامەتی بۆ مافی دەنگدان لە رێکخستندا ساغ بکرێتەوە لەسەر بنچینەی:

أ. لیستی رێکخستن.

ب. رادەی دەنگەکانی هەڵبژاردنی گشتی.

١١. لە هەر مەڵبەندێکدا کۆنفرانسی ناوچەیی ببەسترێت بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی مەڵبەند. هەڵبژاردن بە ئامادەبونی حاکم ئەنجام بدرێ.

١٢. ئەندام بۆی نییە لە دو مەڵبەند، ناوی خۆی بنوسێ و ناسنامە وەربگرێ یان لە دو مەڵبەند دەنگ بدات، یان لە موچەیەك زیاتر وەربگرێ.

١٣. ئەگەر ئەندامێك سەرپێچی کرد سزا ئەدرێ بە یەکێ یا بە هەمو ئەم سزایانەی خوارێ:

أ. دابەزاندنی پلەی حیزبی.

ب. بێبەشکردنی لە خۆ پاڵاوتن بۆ ئۆرگانە حیزبیەکان.

ج. سزادانی دارایی.

ئەندامێکی م س سەرپەرشتی کارەکانی ئەکا.

**دووەم: مەكتەبی ڕاگەیاندن**

گۆڕینی مەكتەبی ڕاگەیاندن لە دەزگایەكی حیزبییەوە بۆ دامەزراوێكی بازرگانی سەرەكی كە چەند كۆمپانیایەكی فەرعی هەبێ:

١. كۆمپانیا بۆ تەلەفزیۆن و سەتەلایت.
٢. كۆمپانیا بۆ ڕادیۆ.
٣. كۆمپانیا بۆ چاپخانە.

ئەم دامەزراوە بودجەی خۆی دابین ئەكا لە: داهاتی خۆی و لەو یارمەتییەی كۆمپانیاكانی دامەزراوی دارایی یەكێتی بۆی دابین ئەكەن.

ئەندامێكی م س دیاری بكرێ لە بۆنە گرنگەكاندا بە ناوی یەكێتییەوە وتەبێژی ڕەسمی بێ.

سێیەم: مەكتەبی ڕێكخراوە دیمۆكراتیەكان

جیاكردنەوەی حیزب لە ڕێكخراوە دیمۆكراتیەكان.

سازكردنی زەمینەی دروستكردنی ڕێكخراوی سەربەخۆ بە:

١. بڕینی موچەی كادرانی سكرتاریەت و سەركردایەتی ڕێكخراوەكان.
٢. حكومەت بودجەی پێویست بۆ چالاكییەكانی ڕێكخراوەكان تەرخان بكات.
٣. ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئازاد بێ دەستێوەردانی حیزب بۆ ڕێكخستنەوەی سەر لە نوێی ڕێكخراوەكان.

ئەندامێكی م.س بەرپرسی پێوەندی ئەبێ لەگەڵ ڕێكخراوە دیمۆكراتییەكان.

چوارەم: مەكتەبی دارایی

پێكهێنانی دامەزراوێكی دارایی، خاوەنی كەسایەتی قانونی و مەعنەوی بێ.

١. هەمو كۆمپانیاو سامانی گوێزراوەو نە گوێزراوەی ئێستای یەكێتی لەم دامەزراوەدا كۆ بكرێتەوە.
٢. یارمەتی مانگانەی حكومەت بۆ یەكێتی تەرخانكراوە لە ڕێگەی ئەم دەزگایەوە بدرێ.
٣. ئەم دامەزراوە، وەك دامەزراوێكی دارایی، بەشدار ئەبێ لە چالاكی دارایی ـ ئابوری ـ بازرگانی و، لە دامەزراندنی پرۆژەی نەوت، گاز، پاڵاوگا، چیمەنتۆ، كارەبا..

٤. بودجەی مانگانەو ساڵانەی یەکێتی و دەزگاکانی ڕێکبخات و موچەی کادرو کارمەندەکانی دابین بکات.
ئەندامێکی م س بەرپرسی ئەبێ.
پێنجەم: بەهێزکردنی ئەم دامەزراوانە:
١. هێزی پێشمەرگە.
٢. پێوەندییەکان ـ کوردستانی، عێراقی، ناوچەیی، جیهانی.
٣. دەزگای هەڵبژاردن.
شەشەم: هەڵوەشاندنەوەی ئەم مەکتەبانە:
١. ڕاگەیاندن.
٢. ڕێکخراوە دیموکراتییەکان.
٣. کۆمەڵایەتی.
٤. مافی مرۆڤ.
٥. بیرو هوشیاری.
٦. نوێنەرانی سکرتێری گشتی لە دامو ودەزگا حیزبییەکانداو مەکتەبی یاریدەدەرەکانی سکرتێری گشتی.
حەوتەم: دامەزراندنی مەکتەبی نوێ مەکتەبێ دابمەزرێنرێ بۆ:
١. چاودێری ئیشوکارەکانی حکومەت و فەرمانبەرەکانی.
٢. پرسینەوەی شکاتی هاولاتیان.
٣. لێکۆڵینەوە لە باری دارایی ئەو کادرانەی بە ناڕەوا دەوڵەمەند بون: کۆمپانیایان هەیە یان هاوبەشن لە کۆمپانیایەکدا. زەوی نیشتەجێ بون یا کشتوکاڵیان داگیرکردوە. کۆشك و سەرایان دروست کردوە.

## (ژماره ٧٤ ی رۆژی دوشەمە ٢٤-٤- ٢٠٠٦)

## رۆژنامەی چاودێر

---

نەوشیروان مستەفا لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ «چاودێر» کە تایبەتە بە دوایین پڕۆژەی بۆ ریفۆرم لەناو یەکێتیدا: مەکتەبی راگەیاندنی ئێمە جۆرێکە لە لاساییکردنەوەی مەکتەبی راگەیاندنی سەردەمی بەعس

رۆژی (١٣)ی ئەم مانگە، بەڕێز نەوشیروان مستەفا پڕۆژەیەکی سێ لاپەڕەیی بۆ ریفۆرم لە نێو یەکێتیدا پێشکەش بە مەکتەبی سیاسیی یەکێتی کرد..
ئەو پڕۆژەیە، چەندین پێشنیازو بۆچونی ئەوتۆی لە خۆ گرتوە کە جیاوازە لە تێکڕای پڕۆژانەی پێشو کە بۆ ریفۆرم لە نێو یەکێتیدا خراونەتەڕو، سەرباری ئەوەی پڕۆژەکە تا رادەیەک مشتومڕی لە نێو کادرەکانی یەکێتی و بەشێکی زۆری ئەو خوێنەرانەدا دروستکردوە کە پڕۆژەکەیان بینیوە...
بۆ رونکردنەوەی وردەکاری و پێشنیازەکانی نێو پڕۆژەکە، دوای رەزامەندی بەڕێزیان بە دیاریکردنی وادەیەک بۆ گفتوگۆکردن، سەعات (٢)ی پاشنیوەڕۆ رۆژی (١٨)ی ئەم مانگە و لە ماڵەکەی خۆیدا لە سلێمانی، ئەم چاوپێکەوتنەمان لەگەڵیدا سازکرد..

---

**چاودێر: کاتێک که پڕۆژکەی جەنابتان ئەخوێنینەوە، تێبینی ئەوە دەکەین پڕۆژەیەکی تەواو تەفکیکییە..**

نەوشیروان مستەفا: مەبەست چییە لە تەفکیکی؟

**چاودێر: مەبەستم لەوەیە: زۆربەی پڕۆژەکانی پێشو کە سەبارەت بە ریفۆرم خراونەتەرو، هەڵئەوەشێنێ و پێچەوانەی هەمو ئەو پڕۆژانەیە، یان زۆرجیاوازە لەو پڕۆژانەی تر کە بۆ ریفۆرم لە ناو یەکێتیدا پێشکەشکراون.. لەوبارەیەوە دەڵێن چی؟**

نەوشیروان مستەفا: نا.. من پێم وانییە.. هیچ هەڵناوەشێنەوە، بەڵام فەرقی بەینی ئەم پڕۆژەیە لەگەڵ پڕۆژەکانی تر ئەوەیە: پڕۆژەکانی تر زۆرتر لە وتار ئەچن، ئەمە بەرنامەی کارە.. یەکێتی نیشتمانی ئێستا ئەندامی تەواوی رێکخراوی سۆسیالیستی ئینتەرناسیۆنالە، بەبیرو بۆچونی من هەتا ئێستا (ی.ن.ك) حیزبێکی شمولییە، ئەم پڕۆژەیەش بۆ ئەوەیە (ی.ن.ك) لە حیزبێکی شمولییەوە، بۆ حیزبێکی سۆشیال دیموکرات بگۆڕدرێ..

**چاودێر: تا چەند ئومێدت بە گۆڕینی ئەم حیزبە هەیە؟**

نەوشیروان مستەفا: ئومێدم بەوە هەیە.. (ی.ن.ك) لە ساڵی ١٩٧٥دا دامەزراوە، ئەو کاتەی کە دامەزرا لە پاش تێکشکانی شۆڕشی ئەیلول و هەرەسهێنانی هەمو داو ودەزگا سیاسی و پێشمەرگەیی و دەزگاکانی تری.. کاتێك هاتە پێشەوە، بۆ شەڕی پارتیزانی و رێکخستنەوەی کۆمەڵانی خەڵك و ئەو شتانە هاتە پێشەوە. لە ژیانی خۆیدا، چەند جارێك خۆی رێکخستۆتەوە بۆ ئەوەی بگونجێ لەگەڵ سەردەما.. حیزب هیچ کاتێك ئامانج نییە، حیزب هەمیشە وەسیلە بوە بۆ گەیشتن بە ئامانج، لەبەرئەوە دەبێ حیزبەکە شێوەیەکی وای هەبێ هەم، لەڕوی بیرەوە، هەم لە روی شێوەی کارکردنەوە، هەم لە روی پەیکەری رێکخراوەییەوە، ئەبێ هەمیشە لەگەڵ ئەو قۆناغە سیاسییەدا بگونجێ کە کاری تیا ئەکات، من بەمە هەوڵمداوە کە (ی.ن.ك) وەکو باسم کرد، سەر لە نوێ رێك بخەیەنەوە بە شێوەیەکی وا کە لە حیزبێکی شمولییەوە بیگۆڕین بۆ حیزبێکی سۆشیال دیموکرات.

**چاودێر: لەو نامەیەتاندا کە سیانزەی ئەم مانگە پێشکەشی مەکتەبی سیاسیتان کردوە، باس لە زۆربەی ئەو پڕۆژانەی کە خراونەتەڕو، لە**

**ڕوی ریفۆرمەوە نەیانتوانیوە بە دیاریکراوی دەست بخەنە سەر هۆی سەرەکی پەشێوانی هەلومەرجی یەکێتی و حکومەتەکەی و هیچیان بە دیاریکراوی ڕێگەی چارەسەریان دانەناوە.. پرسیارمان ئەوەیە: پێت وانییە ئەم پڕۆژەیە لەبێ ئومێدی بەرێزتانەوە بەرانبەر بە پڕۆژەکانی پێشو سەرچاوەی گرتبێ؟**

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ.. ڕەنگە لایەنێکی ئەوە بێ، بەڵام پڕۆژەکان بە گشتی هەمویان بیروڕای زۆر باشیان تێدایە، بەڵام هەمویان لە عمومیاتا ئەخولێنەوە، یەعنی نەچونەتە سەر وردەکاری شتەکان، ئێمە ڕەنگە هەمومان مەسەلەن کە باسی گۆڕان ئەکەین، هەمومان موتەفیق بین لەسەر گۆڕین، بەڵام کە دێیتە سەر گۆڕین، باسی چی ئەکەیت؟ مەسەلەن من لێرەدا باسی ئەوەم کردوە کە مەکتەبی ڕاگەیاندن هەڵبوەشێتەوە، برادەری تر هەیە ئەویش باسی ئەوە ئەکات کە ئەبێ گۆڕین لە ناو مەکتەبی ڕاگەیاندندا بکرێت، بۆچونی من لەگەڵ بۆچونی ئەودا جیاوازە، ئەو پێیوایە ئەگەر چەند کاربەدەستێك لە ناو مەکتەبی ڕاگەیاندن بگۆڕێن و چەند نوسەرێکی باشی بۆ بێنن و چاپخانەکەی باشتر بکەین، شێوەی ڕۆژنامەکە جوانتر بکەین، بەوە دەبێ، لە کاتێکدا من پێموایە مەکتەبی ڕاگەیاندنی ئێمە، جۆرێکە لە لاساییکردنەوەی مەکتەبی ڕاگەیاندنی سەردەمی بەعس، بۆیە مەسەلەن وەهام کردوە.. ئەو برادەرانەی تر مومکینە بۆچونەکانیان لەگەڵ منا جیاواز بێ.

**چاودێر: لەو ڕوانگەیەوە کە دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی لە ڕوی قسەکردن لەسەر کێشەو دیاردەکان، دەزگایەکی داخراوە؟**

نەوشیروان مستەفا: دەزگایەکی حیزبیە.

**چاودێر: کەواتە پێت وانییە هۆکاری سەرەکی ئەم داخرانە بۆ مەکتەبی سیاسی بگەڕێتەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: مەکتەبی سیاسی هەموی یەك جۆر بیر ناکاتەوە.. بیربۆچونی جیاوازی تیایە. ڕەنگە کەسانێك هەبن لە مەکتەبی سیاسی پێیان وابێ کە مەکتەبی ڕاگەیاندن بەو شێوەیەی ئێستا باشە، کەسانی تر هەیە پێیوایە کە ئەتوانن گەشەی پێبدەین، وەکو باسمکرد، بەوەی کە میزانییەکەی زیادبکرێت، چاپخانەکەی باش بکرێت، نوسەرەکانی ژمارەیان زۆر بکرێت، من

خۆم پێموایه: دەبێ گۆڕینی بنەڕەتی بکەین، یەعنی بەپینە پەڕۆو بە ئارایشتکردن ریفۆرم ناکرێت.

**چاودێر: بەم تێڕوانینەی ئێستاوە کە لە نێو مەکتەبی سیاسیدا هەیە، تا چەند پێتوایە: بۆ نمونە یەکێک لە بڕگەکانی پڕۆژەکەتان کە لە بارەی هەڵوەشاندنەوەی مەکتەبی راگەیاندنەوەیە، ئەکرێ جێبەجێبکرێ؟**

نەوشیروان مستەفا: هەندێ لەو شتانە رەنگە ئێستا نەتوانین بیکەین، چونکە ئەوە پەیوەندی بە پەیرەوی ناوخۆی یەکێتییەوەیە. رەنگە هەندێ شت ئێستا بیرەکەی گەڵاڵە ئەکەین، لە کۆنگرە ئەبێ بڕیاری لێ بدرێ.

**چاودێر: مەبەستم ئەوەیە: لە پێشنیازەکانی بەڕێزتاندا لەسەر مەکتەبی راگەیاندن، داوا ئەکەیت بدرێنە چەند کۆمپانیایەک و بە شێوەی جیاجیا، هەر یەکێ لە ناوەندەکان لەڕێی ئەو کۆمپانیایەوە ئەو بودجەیەی کە یەکێتی دابینی ئەکات و هەروا لەڕێی ئەو کۆمپانیایەوە، خۆیان بژێنن، وەکو چۆن لە وڵاتە دیموکراتەکانا هەیە..**

پرسیاری من ئەوەیە: ئایا ئەگەر یەکێك لەو ناوەندانەی راگەیاندن هەندێ شتی بڵاوکردەوە کە لەگەڵ سیاسیەتی یەکێتیدا ناکۆك بو، ئایا پێت وانییە دواجار یەکێتی بۆ خۆی لە رێی ئەو کۆمپانیایەوە بودجەکەی دەبڕێت؟

نەوشیروان مستەفا: خۆی ئەو کۆمپانیایانە کە دروست ئەکرێن، راستە تارادەیەك وایەتە بەرچاو کە سەر بە کەرتی تایبەتییە، بەڵام تا ئەو زەمانەی کە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنەکەی و بەرپرسەکەی و بودجەکەی لەلایەن یەکێتییەوە تەئمین بکرێت، پێموایە هەر لە ژێر دەسەڵاتی یەکێتیدا ئەبێت، لە ژێر کۆنترۆڵی یەکێتی ناچێتە دەرەوە، بەڵام ئەم زەمانە زەمانی ئەوە نەماوە کە تۆ رۆژنامەیەك دەربکەی لە بابەتی رۆژنامەکانی حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەوروپای شەرقی، ئەم زەمانە ئەبێت جۆرێك لە ئازادی بدرێت بە نوسەرو رۆژنامەنوسەکان. بۆ ئەوەی بیروبۆچونی جیاجیا بهێننە پێشەوە، شتێك کە نەبێت بە هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەکەمان، نەبێتە هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی حیزبەکەمان، بۆ سەر ئاسایشی گەلەکەمان، لەو سنورەدا با خەڵك بۆخۆی قسە بکات.

**چاودێر: هەندێ جار ڕۆژنامە ئەهلییەکان نهێنییەکانی پشت پەردەی ناو مەکتەبی سیاسی بڵاوئەکەنەوە، ئایا پێت وایە لە حاڵەتێکی وادا ئەو ڕۆژنامەیەی یەکێتی کە پێشنیازتان کردوە لە ڕێی کۆمپانیایەکەوە دەریبکات، دەتوانێ دەست لەو شتانە وەربدات؟**

نەوشیروان مستەفا: بۆ ناتوانێ.. بەڵێ ئەتوانێ. مەسەلەن جەزیرە هی قەتەرە و ئێستا توانیویێتی لە ڕاگەیاندنی عەرەبیدا سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بە دەستبهێنێ، هەرچەندە خەڵکی عێراقی لێی ڕازی نیەو بەعزێ لە عەرەب لێی ڕازی نییە، بەڵام لە بواری پیشەیی بونی ڕاگەیاندندا وا تەسەوری ئەکەی کە دەزگایەکی سەربەخۆیەو عەلاقەی بەسەر هیچ کەسێکەوە نییە، بەڵام لە هەقیقەتدا هی قەتەرییەکانە، شێخی قەتەر خۆی سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنەکەیەتی.

**چاودێر: کەواتە پێتوایە مومکینە یەکێتی بتوانێ کراوەبێ بۆ بونی دەزگایەکی ڕاگەیاندنی لەوجۆرە؟**

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ پێموایە.

**چاودێر: یەکێکی تر لەو پێشنیازانەی کە لە پرۆژەکە بەڕێزتاندا کراوە، هەڵوەشاندنەوەی هەریەک لە مەکتەبەکانی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان، مافی مرۆڤ، بیروهۆشیاری، و کۆمەڵایەتییە.. ئەم پێشنیازە بۆچی؟ یان ئایا پێتان وایە ئەم مەکتەبانە نەیانتوانیوە ئەرکەکانی سەرشانیان ڕاپەڕێنن؟**

نەوشیروان مستەفا: نەخێر.. پێموایە ئەوانە هەر یەکەیان ئەرکی خۆی لە قۆناغێکی مێژوییدا بەجێهێناوە، بەڵام ئێستا قۆناغێکی تازە هاتۆتە پێشەوە، بۆ نمونە مەکتەبی کۆمەڵایەتی کاتی خۆی من پێشنیارم کردوە، کە لە هەمو مەڵبەندێکا کەسێك هەبێت بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی، بەڵام ئەو زەمانەی کە پێشنیاری ئەوەمان کرد، جۆرێ لە بەرەڵڵایی ئاسایش هەبو، هێشتا نەمانتوانیبو داو و دەزگای ئاسایش بە ڕێکوپێکی دروستبکەین، داو و دەزگای قەزایی ڕێکو پێکمان نەبو.. حاڵی حازر، ئێمە دادگامان هەیە، پۆلیسمان هەیە، ئاسایشمان هەیە، دەزگایەکی بەڕێوەبردنی تەواومان لە وڵاتدا هەیە، لەبەر ئەوە پێویست بەوە ناکات شتێك کە شانبەشانی ئەوە هەبێت، کە لە سەر دەمێکا کە ئێمە دەسەڵاتمان نەبو بەسەر ناوچە سنورییەکان و بەسەر شارە دورەکانی، دەمانتوانی لەو

ڕێگەیەوە کاروبارەکانی بکەین، بەڵام کە تۆ هەوڵبدەیت دەوڵەتی قانون دروستبکەیت، قانون سەروەر بێت، مەفروزە شتەکان لە ڕێگەی دادگاوە بکرێت، لە ڕێگەی حکومەتەوە بکرێت، نەك لە ڕێگەی دەزگایەکی حیزبییەوە.

**چاودێر: پێشتر لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەنوسیدا، بەڕێزتان باستان لەوەکرد ئێمە لە کوردستانا دادگامان نیە، بە جۆرێ کە بە ئەرکی خۆی هەستابێ، بەڵام ئێستا قسە لەسەر ئەوە ئەکەیت کە دادگامان هەیە، ئایا ئەمە دو بۆچونی جیاواز نییە؟**

نەوشیروان مستەفا: من قەت نەموتوە دادگامان نیە.

**چاودێر: بەڵێ.. لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستانداو بەر لە زیاتر لە مانگێک، وتتان: دادگامان بەو مانایە نیە کە ئەرکی خۆی وەکو پێویست ڕاییکردبێ؟**

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئێستاش وا ئەڵێم.. دادگا مەفروزە سەربەخۆیی کاملی هەبێ، ئەو پێوەرانەی کە دایئەنێی بۆ هەڵبژاردنی قازی، یا حاکم، پێوەرێکی پیشەیی صرف بێت، نەك ئیعتیباری سیاسی و ئەوانەی تیابێت. بەداخەوە، حاکمەکانی ئێمە چ ئەوانەی لە ئیدارەی سلێمانی دانراون، چ ئەوانەی لە هەولێر دانراون، تا ئەندازەیەکی زۆر ڕەنگە هەندێك ئیعتیباراتی سیاسی و شتی لەو بابەتانەی تیا لێکدرابێتەوە، من ئومێدم وایە لە یەکخستنەوەی هەردو وەزارەتی داددا، جارێکی تر چاوبخشێننەوە بە پەیکەری وەزارەتەکەو بە حاکمەکان.. و من خۆم باوەڕم وایە کە دادگا هەیە، کاروبارەکانی خۆشیان ئەکەن، بەڵام ڕەنگە هەندێ کەم وکوڕی تیابێ، ئەگەر نەتوانرابێ بە تەواوەتی حوکمی قانون جێبەجێ بکرێ، خەتاکەی ناگەڕێتەوە بۆ دادگا، خەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرکردایەتیی سیاسی.

**چاودێر: ڕەنگە من بۆخۆم وەکو هاوڵاتییەک لەگەڵ هەڵوەشانەوەی ئەو مەکتەبەدا بم، بەڵام پرسیارم ئەوەیە لە حاڵەتی دادگایەکی نەخۆشدا وەک هەندێ پێیان وایە ئەمڕۆ لە کوردستاندا هەیە، ئایا مانەوەی مەکتەبی کۆمەڵایەتی نابێتە زەرورەت؟**

نەوشیروان مستەفا: نەخێر.. پێموایە قۆناغەکەی تێپەڕیوە.

**چاودێر: ئەی دەربارەی مەکتەبەکانی ڕێکخراوە دیموکراتیەکان و مافی مرۆڤ و بیرو هوشیاری کە داوای هەڵوەشاندنەوەیان دەکەی؟**

نەوشیروان مستەفا: جارێ ئێمە هەر وەزارەتێکمان هەیە بە ناوی وەزارەتی مافی مرۆڤ، کێیش ئەیەوێ شکات بکات، دادگا هەیە، ئەتوانێ بڕوا شکات بکات، هەر لە عەینی شوێنا پێشنیارم کردوە مەکتەبێکی تازە بکرێتەوە بۆ گوێگرتن لە شکاتی خەڵك، بە تایبەتی شکاتی ئەندامەکان.. لەبەر ئەوە پێموایە مەکتەبی مافی مرۆڤ، بە تایبەتی ئێستا، هەمو ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ بە ئازادی ئەتوانن بێن بۆ کوردستان سەردانی زیندانەکان بکەن، سەردانی خەڵك بکەن، خەڵك ببینن، ڕۆژنامەنوس بێت بۆ ئێرە. مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتیەکانیش، من پێم وایە وەکو لەوێدا نوسیومە: کاتی ئەوە هاتوە ئێمە ڕێکخراوە دیموکراتییەکان لە دەسەڵاتی حیزب جیابکەینەوە و هەوڵبدەین ئەوانە ڕێکخراوی پیشەیی بن، ڕێکخراوی سەربەخۆ بن، ئێمە یارمەتیان بدەین ئەوەی کە پێیدەڵێن ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی.

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دەبێ تابعی هیچ حیزبێك نەبن، یەعنی من خۆم باوەڕم بەوە هەیە، بۆ مەکتەبەکانی، تر کە وەکو باسمکرد، لە قۆناغێکی مێژوییدا زەروری بوە ئەمانە هەبن، بەڵام لەم قۆناغەدا من بە زەروری نابینم.

**چاودێر: داوای بڕینی موچەی ئەو کادرانە، سکرتێری ڕێکخراوەکانت کردوە.. پێتوایە ئەوانە تەنیا موچەخۆرن، وەک لەوەی بە کردار ئەندامی کاری ڕێکخراوی کۆمەڵگای مەدەنی بن؟**

نەوشیروان مستەفا: من خۆم ناچێتە ئەقڵمەوە خوێندکارێکی زانکۆ هەر لەبەرئەوەی کە ئەبێ بە سکرتێری ڕێکخراوێك یا ئەچێتە سەرکردایەتی ڕێکخراوێك، ئەو موچەیەی کە وەکو خوێندکار وەریئەگرێت، لە موچەی مامۆستایەکی زانکۆ زیاتر بێت، یاخود بە قەدەر ئەوە وەربگرێت. من بە ڕێگەیەکی دروستی نازانم پەروەردەکردنی گەنجی تازە بەو شێوەیە بکرێت، ئێمە ئومێدێکی زۆرمان بەوە هەیە لەو ڕێکخراوە دیموکراتیانەوە سەرکردەکانی پاشەڕۆژی حیزبەکەمان و میللەتەکەمان بێنە دەرەوە، تۆ لە ئێستاوە فێری مشەخۆریان بکەی، من پێموایە ڕێگایەکی ڕاست نییە.

**چاودێر: کەواتە پێتوایە لە کۆی گشتی بۆچونەکانتان ئەو چەند مەکتەبەی کە داوای هەڵوەشانەوەیان ئەکەی، لە بری خزمەتکردن رۆڵی نێگەتیڤیان بینیبێ..**

نەوشیروان مستەفا: بۆچی وا.. لەڕوی نێگەتیڤ، یەعنی هەندێ شت هەیە خۆی مەوجودە چاکی بکەیت، باشتری بکەیت، ئەوەی کە کۆنترۆڵی حیزب لەسەر رێکخراوە دیموکراتیەکان نەمێنێ، خۆی لە خۆیدا ئەوە باشترکردنی ژیانی رێکخراوەیی ئەو رێکخراوانەی کۆمەڵگەی مەدەنیە، نەك خراپکردن و هەڵوەشانەوەی، یاخود دەوری بە عەکسەوە.. مەسەلەن بونی رێکخراوی خوێندکاری زۆر زەروریە، بونی سەندیکای پزیشکان، ئەندازیاران.. یەعنی ئەو پیشانەی کە خۆیان یەکیان گرتوە، هی کرێکاران شتێکی زۆر زەروری و باشە، من ئەوەی کە لەوێدا باسمکردوە، باسم لەوە نەکردوە کە ئەمانە بڕوخێنرێ، باسم لەوە کردوە کە زۆرتر سەربەخۆییان بدرێتێ، لە باتی ئەوەی بە حیزبەوە مەربوت بن، بودجەیان لەلایەن حکومەتەوە دابین بکرێ، بۆ ئەوەی سەربەخۆیی زیاتریان هەبێ، حیزب کەمتر دەست وەربداتە کاروبارەکانیانەوە، لە باتی ئەوەی حیزب دانیشێ سکرتاریەتی ئەم رێکخراوانە هەڵبژێری و سکرتێر بۆ ئەو رێکخراوانە هەڵبژێرێ، ئەوانە خۆیان جۆرێك لە ئازادیان هەبێ بۆ هەڵبژاردنی سەرکردەکانیان.

**چاودێر: ئێوە لە پرۆژەکەتاندا باسی ئەوەتان کردوە چاکسازیکردنی حیزب مانای چاکسازیکردنی حکومەتە.. مەبەستم ئەوەیە: قسەتان لەسەر چاکسازیی حکومەت نەکردوە، ئەمەیان بۆ؟ ئەگەر حکومەت گەندەڵە، کەواتە پێت وایە بەرپرسیارێتی یەکەم بۆ حیزب دەگەڕێتەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: لە پێشەکی پرۆژەکەدا نوسیومە لە پێشا بۆ ئەوەی بتوانی حکومەت چاك بکەی، دەبێ لە پێشا حیزب چاك بکەیت، ئەگەر ئیسلاحات لەناو حیزبەکەدا بکەیت، ئینجا ئەتوانی ئیسلاحاتی ناو حکومەت بکەی، مەسەلەن بۆ نمونە: سێ مانگە ئێمە هەمو مەکتەبی سیاسی لە بەینی خۆمانا ئەیهێنین و ئەیبەین، نەمانتوانیوە لەسەر نۆ ناو رێکبکەوین، کە من پێموایە ئەگەر مەجموعەیەك پێوەرمان دابنایە بۆ ئەوەی کێ ئەتوانێ ببێ بە وەزیر، سیڤیەکانت وەربگرتایە و ئەو پێوەرانەت جێبەجێبکردایە، لەسەر هەر یەکێ لەو کاندیدانەی کە دائەنرێت، مەجموعەیەکت لێ هەڵئەبژاردو تەرشیحت ئەکرد و هیچ پێویستی بەوە نەئەکرد

ژمارەکەیان ئەوەندە زۆر بێ و ئێمەش سێ مانگ پێوەی خەریک بین و ئاخر شتێش بڕۆین بە دەنگدان بیکەین.

**چاودێر: ئەم پرسیارە ڕەنگە لە پڕۆژەکەمان دوربخاتەوە، بەڵام بۆ ڕێکنەکەوتن لەسەر ئەو وەزیرانە؟**
نەوشیروان مستەفا: لەبەر ئەوەی هەرکەسەو پاڵێوراوی خۆی هەیە.

**چاودێر: ئەوەی پەیوەندیدارە بە حکومەتەوە، بۆچی بە تەواوەتی قسەت لەسەر حکومەت نەکردوە؟ تۆ یەکێکی لەو کەسانەی کە لە چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەنوسیەکانا ڕەخنەی زۆرت لە حکومەتی هەرێم هەیە؟**
نەوشیروان مستەفا: کاکی برا.. ئەو حکومەتە چەندە خراپ بێ، چەندە گەندەڵ بێ، حکومەتی خۆمە.. لەبەرئەوە من هەقی خۆمە ڕەخنەی لێ بگرم، چونکە ئەمە واجهەی حیزبەکەمە، ئەوە ڕەنجی میللەتەکەمە، ئەو حکومەتە ئیدارەی میللەتەکەم ئەکات، لەبەر ئەوە من بە مافی سروشتی خۆمی ئەزانم ڕەخنەی لێ بگرم، ئەوە بە دەلیلی ئەوە نیە کە من دژی حکومەتم، حکومەت هەر چۆنێک بێ، باش یا خراپ، بەهی خۆمی ئەزانم. ئێستا لە قۆناغێکداین کە بەرەو یەکگرتنەوەی هەردو ئیدارەکە ئەچین، یەعنی کاتی ئەوە نییە ئێمە خەریکی ئەوە بین. با ئیدارەکە یەکبگرێتەوە، ئەوسا قسەیەکیش لەسەر ئەوە ئەکەین.

**چاودێر: پێت وایە کۆی ئەو ڕاسپاردەو پێشنیازانەی کە لە نێو پڕۆژەکەتاندا پێشکەشتانکردوە، لەم قۆناغە دا تا چەند لە توانادایە جێبەجێبکرێن، یاخود پێتان وانییە زۆربەی ئەو شتانە ئەبێ بچنەوە بۆ کۆنگرە و لەوێ بڕیاریان لەسەر بدرێت؟**
نەوشیروان مستەفا: ئەگەر بتوانین تا ئەندازەیەکی زۆر ئەو ئەندامانەی مەکتەبی سیاسی ئیقناع بکرێن بەوەی کە ئەم جۆرە گۆڕینە کارێکی پێویستە، ئەتوانین لە ئێستاوە زەمینەسازی بۆ بکەین تا ئەگەینە کۆنگرە هەموی جێبەجێبکەین، بۆ ناتوانین؟!

**چاودێر: یەکێ لە پێشنیازەکانتان بە هێزکردنی دامەزراوەی پێشمەرگەیە..**

هەندێ بۆچونی تر هەیە پێیوایە پێویست بەوە دەکات دەزگای پێشمەرگە وەکو میلیشیا نەمێنێ و هەموی بچێتە چوارچێوەی هێزێکی نیزامییەوە، لە بەرئەوەی ئێستا ئێمە لە قۆناغی بنیاتناندایین نەوەك شۆڕش..

پرسیارم ئەوەیە: ئایا ترسێك هەیە لەلای تۆ کە داوای بەهێزکردنی دەزگای پێشمەرگە ئەکەیت؟

نەوشیروان مستەفا: من مەبەستم پێشمەرگەیە کە تۆ باستکرد.. پێشمەرگەی یەکگرتوی حکومەتی هەرێمی کوردستان؟

**چاودێر: سەبارەت بەوەی کە داوا ئەکەی مەکتەبێک پێکبهێنرێ بۆ چاودێری کردنی ئیش وکارەکانی حکومەت و فەرمانبەرەکانی، ئایا ئەمە نابێتەوە بە دەست تێوەردانی حیزب لە کاروباری حکومەت؟**

نەوشیروان مستەفا: نەخێر. مەسەلەن ئەو پێشنیارە هەندێ بەندی بەستراوە بە هەندێ بەندی ترەوە. ئێستا ناڕەزایی خەڵك هەیە لە سەر کەمی خزمەتگوزاری، لەبەر ئەوەی هەندێك قەزا بە هەندێك قەزاوە نوساوە، یان چەند قەزایەك بە یەکەوە مەڵبەندێکیان هەیە، جاری وا هەیە مەسەلەن ئێمە ئاگامان لێ نیە کە لە چی دابێت، بەڵام تۆ کاتێك کە باسی ئەوە ئەکەیت چاودێریکردنی کاروباری حکومەت بەتەنیا بریتی نیە لە چاودێریکردنی ئیش و کاری وەزیرێك، مەسەلەن لە پێنجوێن مەفروزە ئەو رێکخستنەی کە یەکێتی لە پێنجوێن هەیەتی، ئەوان چاودێریی ئیشوکارەکانی حکومەت بکەن، چاودێری ئەوە بکەن بزانن لە بواری ئاوەدانکردنەوەدا چی ئەکەن؟ لە بواری ئاسایش چۆن رەفتار ئەکەن؟ پرۆژەکان چۆن جێبەجێ ئەکرێت؟ باش بەڕێوە ئەچێت؟ خراپ بەڕێوە ئەچێت؟ ئەمانە کە دێن ئاگاداری مەکتەبی رێکخستن و مەکتەبی سیاسی ئەکەن، ئەوساکە ئەوانیش ئەتوانن لە رێگەی ئەو پەیوەندییەی کە لەگەڵ حکومەتا هەیانە، بڵێن وەزعی ئیدارە لە فلان جێگادا باش نیە هەوڵبدەن چاکیبکەن، و نوقسانیەکانی بریتییە لەو شتانەی خوارەوە، ئەوە دەستێوەردان نییە، عادەتەن لە هەمو جێگایەکی دنیادا راگەیاندن یەکێ لە کارەکانی ئەوەیە کە چاودێری حکومەت ئەکات و کەموکوڕییەکانی ئەخاتە بەرچاو، چ لە رۆژنامە بێ، یا لە تەلەفزیۆن بێ، یا لەڕادیۆ بۆ ئەوەی کە چاکبکرێت.

چاودێر: پێتوایە تا ئێستا ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هیچ ئیستجابەیەکیان بۆ پرۆژەکەتان هەبوە؟

نەوشیروان مستەفا: هەندێ گفتوگۆی لە سەر کراوە، بەڵام هێشتا گفتوگۆکان لە سەری تەواو نەبون.

**چاودێر: پێتوایە بەشی هەرە زۆری ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، کۆک بن لەگەڵ بۆچون و پێشنیازەکانتا؟**

نەوشیروان مستەفا: نازانم.

**چاودێر: لە برگەی چوارەمی پرۆژەکەی جەنابتان سەبارەت بە مەکتەبی دارایی، داوای پێکهێنانی دامەزراوەیەکی داراییتان کردوە، بە جۆرێک بەشداربێ لە چالاکیی دارایی و ئابوری و بازرگانی و دامەزراندنی پرۆژەی نەوت و گازو پاڵاوگە و چیمەنتۆ و کارەبا..هتد.**

**پێتوانیە ئەمە دیسانەوە هێنانی حیزبە بۆ ناو بازاڕ؟**

نەوشیروان مستەفا: نەخێر هەمو حیزبێك لە کوردستانا بۆی هەیە کۆمپانیا دروستبکات، کاری بازرگانی بکات، من خۆم زۆر زۆر پێم خراپە کە چ حکومەت، چ حیزب لە بازاڕا دەست وەربداتە بازاڕو ببێ بە شەریك، ببێ بە هاوبەشی کۆمپانیاکان، ئەمە کۆمپانیایەك ئەبێ منافسە ئەکات لە گەڵ کۆمپانیاکانی ترا، نابێ بە کۆمپانیایەکی زاڵ بە سەر ئەوانی ترەوە و ببێ بە هاوبەشیان و سەرانەیان لێ بسێنێ، وەکو هەمو کۆمپانیایەکی ئاسایی ئەچێتە بازاڕەوە، لە بازاڕا منافسە لەگەڵ لایەنەکانی ترا ئەکات..و من باوەڕم وایە لە کوردستانا هێشتا کۆمپانیای زۆر گەورەی تیا نیە ئەگەر حیزبەکان و حکومەت دەستی لێ بەربدات، بۆیە پێم باشە ئێمە دەست پێشخەربین لەوەی کە هەندێ لەو پرۆژانەی پەیوەندیان بە ژێرخانی کۆمەڵەکەمانەوە هەیە، بەژێرخانی ئابوری کوردستانەوە هەیە، کە بریتییە لە نەوت و گازو ئەو جۆرەشتانەی کە لەوێدا باسکراون، ئێمە دەستپێشخەربین بۆ ئەوە، چونکە بازرگانەکانی ئێمە تاوەکو ئێستا جورئەتی ئەوە ناکەن خۆیان لە قەرەی ئەو شتانە بەن، یەعنی ئەگەر تۆ لە بیرت بێ هەتا لە شوێنێکی وەکو سلێمانیدا، (دە) ساڵ لە مەوپێش هیچ بازرگانێك ئامادە نەبو ئوتێلێکی بەینێ ئاوەدانی بکاتەوە یان ئەرزێکی بەینێ شتێکی رێکوپێکی لە سەر دروست بکات، چونکە باوەڕیان بەو ئارامیە نەبو کە لە کوردستانا تا سەر جێگیربێ،

لە بەرئەوە مەجبوربوین خۆمان کردمان، یەعنی مەجبوربوین ئێمە چوین دەستپێشخەریمان کرد، بازاڕمان دروستکرد و ئوتێلمان دروستکردو شتمان دروستکرد، ئێستا ئیتر ئەم قۆناغە تێپەڕیوە، ئەتوانی ئەو شەریکەیە، ئەسڵەن هەر شەریکەیەکی موساهم بێت، یەکێتی بەشی هەبێت و هەندێك لە سەرمایەدارەکانی کوردیش بەشداربن تیایدا.

**چاودێر: داوای پێکهێنانی مەکتەبێکت کردوە بۆ لێکۆڵینەوە لە باری دارایی هەندێ لەو بەرپرسانەی کە ناڕەوا دەوڵەمەند بون، ئایا ئەمە توانای مەکتەبێکە چارەسەری بکات، یا بەر پرسیارێتیی راستەوخۆی ئەکەوێتە ئەستۆی مەکتەبی سیاسی؟**

نەوشیروان مستەفا: تۆ وەکو رۆژنامەنوسێك ئەو شتانە نابینی؟!

**چاودێر: بەتەئکید دەیبینم.. بەڵام رەنگە مەکتەبێک دەرەقەت نەیەت. زۆر جار لەمبارەیەوە گلەیی لە ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی دەکرێ.. پێت وایە مەکتەبێک بتوانێت ئەوە چارەسەر بکا، یا خود ئەوە بەرپرسیارێتی سکرتێری گشتی و جێگری سکرتێر و مەکتەبی سیاسییە پێکەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: من پێموایە ئەگەر ئەو مەکتەبە دروستبکرێت و یەکێتی بەجدی بیەوێ پیشتیوانی بکات، ئەتوانێ جێبەجێی بکات، بەڵێ.

**چاودێر: تا چەند پێتوایە یەکێتی بە جدی ئەبێت؟**

نەوشیروان مستەفا: نازانم

**چاودێر: تۆ بۆ خۆت گەشبینی لەوەی کە لە ناو مەکتەبی سیاسیدا، لە سەرکردایەتیی یەکێتیدا، پشتگیری مەکتەبێکی لەو جۆرە بکەن؟**

نەوشیروان مستەفا: من گەشبینم لەوەی کە بەشی هەرە زۆری کادرو ئەندامەکانی یەکێتی پشتگیری لەوە ئەکەن. رەنگە لە ناو مەسئولەکانا هەبێ پێی ناخۆش بێ، پێی خراپ بێت، پێی وابێ ئەوە ئەبێ بە سەبەبی ئەوەی کە یەکێتی تێك ئەدات، بەڵام لە راستیا پێموایە ئەمە رەنگە زەرەر لە قازانجی تایبەتی هەندێ کەس بدات، بەڵام بە عام بۆ یەکێتی باشە و پێموایە قاعیدەی یەکێتیش و ئەندامەکانی پێیان خۆش ئەبێت، لەم روەوە من

گەشبینم.

**چاودێر: کاک نەوشیروان.. ئێستا بەڕێزتان کەسی دوەمی ناو یەکێتین، ئەوە بەرپرسیارێتییەکی گەورەیە، لە حاڵەتێکی وادا بەرپرسیارێتی ئەو کارە، یان ئەو مەکتەبە، روبەڕوی بەڕێزتان بکرێتەوە ئەیکەیت؟**

نەوشیروان مستەفا: لە ناو یەکێتیدا بۆ ئەوەی ئەو مەعلوماتەت بۆ راست بکەمەوە، کەسی دوەم و سێیەم و چوارەم نیە، کەسی یەکەم هەیە و لە دوای ئەو کەسی دوەم نیە.

**چاودێر: یەعنی کەواتە بە فیعلی تۆ کەسی دوەم نیت؟!**

نەوشیروان مستەفا: نەخێر!

**چاودێر: دەربارەی ئەو پێشنیازەتان کە کردوتانە بۆ هەڵوەشاندنەوەی یاریدەدەرێتی سکرتاریەتی گشتی و هەروەها نوێنەرانی سکرتێری گشتی لەناو مەڵبەندەکانا نەهێڵرێت.. ئەمە لە کوێوە سەرچاوەی گرتوە؟**

نەوشیروان مستەفا: پێموایە شتێکی زیادەیە، مەسەلەن مەسئولی مەڵبەندەکان چین؟ ئەوانیش نوێنەری سکرتێری گشتی و مەکتەبی سیاسین لە هەندێ حاڵەتدا نازانم یەعنی ئەوانە چ ئیزافاتێك ئەکەن، یەعنی من بەش بە حاڵی خۆم پێم وایە هەر مەڵبەندێك لەو مەڵبەندانە هەموی نوێنەری من و هەموشی بە نوێنەری سکرتێری گشتی حیزبەکەم ئەزانم، لە بەرئەوە چ ئیجاب ئەکات کە یەکێك لە مەڵبەنددا دابنیشێ، بڵێن ئەمە بۆ جاسوسی بەسەرمانەوە دانیشتوە.

**چاودێر: ئەم پێشنیازەت پێشتر بە سکرتێری گشتی وتوە؟**

نەوشیروان مستەفا: نەخێر پێم نەوتوە.

**چاودێر: پرۆژەکەت پێشکەشی بەڕێز مام جەلال کردوە؟**

نەوشیروان مستەفا: داومە بە مەکتەبی سیاسی، ئەوانیش مەفروزە بۆی بنێرن، ئەوانەی کەلە کارگێڕی مەکتەبی سیاسین. بە دزییەوە نەمکردوە بە ئاشکرایە، کە داومە بە مەکتەبی سیاسی، مەفروزە بەسەر هەمویاندا دابەش بکرێ تەنانەت ئەوانەشی کەلەناو شاری سلێمانیدا نین.

**چاودێر: ئێستا جەنابی مام جەلال لە بەغدایە وەکو سەرۆک کۆمار، کێ کەسی یەکەمە لەم هەرێمەدا و سەرپەرشتی یەکێتی ئەکات؟**
نەوشیروان مستەفا: هەر مام جەلال.

**چاودێر: دوا پرسیارمان ئەوەیە زۆر جار وا لێکدراوەتەوە کە ڕەش بینن، یان وا لێکدراوەتەوە کە کاک نەوشیروان بێدەنگە بەرانبەر بە هەندێ شت، یاخود بێزاربوە لە چارەسەرکردنی هەندێک گەندەڵی، یان هەندێ کێشە؟**

نەوشیروان مستەفا: پێموایە بۆ ئەوەیان بە هەڵە چوی.. من ئەگەر ڕەش بین بومایە، لێرە بەشداریم لە خەباتا نەئەکرد، بەڵام من کەسێکم دایمە هاوبەشیمکردوە لە داڕشتنی پلانی کارکردندا، لە سەردەمێکا کە موجازەفە یەکێکە لە ڕەگەزە سەرەکیەکانی کارکردن، هەمیشە ئەو پلانەی کە من دامنابێ، هەوڵمداوە کە خراپترین حاڵەت لە بەرچاو بگرم، بۆ ئەوەی کە تێك نەشکێین، لەوبارەیەوە هەندێ کەس من بە ڕەش بین ئەزانێ، ئەگینا من ئەگەر ڕەشبین بومایە، ئەسڵەن بەشداریم نەئەکرد لە کاری سیاسیدا.

**چاودێر: بەڵام ئەوەی کە ناوی باڵی ریفۆرمە، یان بڵێین ئەو چەند کەسەی کە بانگەشەی ریفۆرم ئەکەن لەناو یەکێتیدا، پێت وایە دواجار ئەتوانن ریفۆرم بکەن؟**
نەوشیروان مستەفا: ئومێدم وایە.

**چاودێر: زۆر سوپاس.**
نەشیروان مستەفا: سوپاس.

(٢٧ ی ٦ ی ٢٠٠٦)

# ڕۆژنامەی ئاسۆ

ستران عەبدوڵا سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن و سەرنوسەری ئاسۆ، ئەم گفتوگۆیەی ساز کردوە و، ڕۆژنامەی ئاسۆ: لە ژمارە ٢٤٢ ی ڕۆژی سێشەمە ٢٧ ی ٦ ی ٢٠٠٦ دا بڵاوی کردۆتەوە. ئەوەی لێرەدا بڵاو کراوەتە، وەکو خۆی، لە ڕۆژنامەی ئاسۆ ڕاگوێزراوە.

## نەوشیروان مستەفا بۆ ئاسۆ:
## پێویستمان بەدەستکاریی کردن هەیە لە سەرکردایەتی یەکێتی‌دا

سلێمانی، ئاسۆ: نەوشیروان مستەفا رایگەیاند «پرۆسەی چاکسازی کودەتای سەربازی‌و جەنگی نییە» بەڵکو «پرۆسەیەکی تەدریجییەو هەنگاو بەهەنگاو بۆ پێشەوە دەڕوات» و «ئێمە لەیەکە رێکخراوەییەکانی یەکێتیشەوە دەستمانپێکردوە»چونکە «رێکخستن دڵی یەکێتییە». لەدیدارێکی تایبەتی ئاسۆدا جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی رونیکردەوە کە دواکەوتنی بەستنی کۆنگرەی سێیەمی یەکێتی پەیوەندی بە گۆڕانکارییەکانی کوردستانی عیراقەوە هەبوە لە روخانی رژێم‌و مەسەلەی دەستورو هەڵبژاردنەکانی عیراق «ئەگینا من پێم وانییە کە سەرکردایەتی یان مەکتەبی سیاسی یەکێتی ئەوەندە بتوانێ بە پێچەوانەی ئارەزو و بە پێچەوانەی ویستی زۆرایەتی ئەندامەکانی کاربکات» بەڵکو «جاری واهەیە ئەولەویەت بۆ کۆنگرەیەو جاری واش هەیە بۆ دەستورو بردنەوەی هەڵبژاردنە». هەروەك رونیکردەوە باسکردنی چاکسازی مانای ئەوە نییە یەکێتی وەزعی زۆرخراپە «هەندێك جار زیادەرۆیی تێدا دەکرێت، ئەگینا تائیستا یەکێتی هێزێکی گەورەو سەرەکی ناو گۆرەپانی سیاسیی کوردستانی عیراقە» و «باشترین بەڵگەش هەڵبژاردنە... هەتا لە وڵاتانی پێشکەوتوش کە وەختێك هەڵبژاردن دەکەن بەڵێنی ریفۆرم بە خەڵکی دەدەن»و گوتیشی «ئێمە لەم قۆناغەدا پێویستمان بە دەستکاری هەیە لە پەیڕەوی ناوخۆ، لەبەرنامەی سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئابوریی‌و رۆشنبیریی یەکێتیدا، پێویستمان بە دەستکاریی کردن هەیە لە سەرکردایەتی یەکێتیدا» بۆیە «ئەگەر ئێمە بتوانین بەگوێرەی پەیڕەوی ناوخۆ هەردو ساڵ جارێك هەڵبژاردن لەناو مەڵبەندەکاندا بکەین‌و کۆنگرەش ببەستین، ئەوا پێویست بەوە ناکات دەساڵ چاوەڕێ بکەین». دەربارەی تەکەتولیش وتی «تەکەتول ئەگەر هەندێك جار لەسەر بنەمای سیاسیی‌و فکریی بێت، بۆ جێبەجێکردنی ئامانجێکی سەرەکی بێت لەناو یەکێتیدا، شتێکی ئاساییە».

دیوانی لێپرسینەوە، نەوشیروان مستەفا هەروەك ئەوەی رەتکردەوە دیوانی لێپرسینەوە بۆ تەسفیەی حیسابی سیاسیی بەکاربهێنرێت «ئەگەر یەکێك گەندەڵی نەکردبێت چۆن دەتوانیت تۆمەتباری بکەیت بەگەندەڵی‌و شتی لەسەر ساغ بکەیتەوە؟»

چونکە «ئەو کەسە بۆی هەیە شکات بکاتو دەتوانێ لە مەکتەبی سیاسیی یان دادگایی شکات تۆمار بکات». راشیگەیاند کارەکانی دیوانەکە دەبێت زۆر دەقیقو ورد بێت «چونکە ئەو مەسەلەیە زۆر حەساسە، دەتوانێت بەیەك پڕوپاگەندەی خراپ سومعەی گەورەترین کەس بشکێنی. کە وەختێك کەوتە سەر زمانی خەڵك دە جار راستی بکەیتەوە هیچ نییە». هەلومەرجی دەوڵەتی کوردستان لەبەشێکی تری دیدارەکەدا نەوشیروان باوەڕی خۆی نیشاندا کە زەمینەی ئەوەی ئیسلامی سیاسیی کاروبار لەکوردستان بگرێتە دەست «لەم قۆناغەو تاچەند ساڵی تریش شتی وا لەگۆڕێ نییە» و پاش چەند ساڵێکی تریش «بەڕاستی من نازانم». هەروەك ئاماژەی بەوەکرد «بە پێچەوانەی هەندێك بۆچونی نوسەرو رۆشنبیر، من پێم وایە ئێستا هەلومەرجی دروستکردنی دەوڵەتی کوردستان لە عیراقدا کامڵ نەبوە»و گوتیشی «بەداخەوە مەسەلەی کەرکوك وەك مەسەلەی کوردی یان عیراقی روت نەماوەتەوە، چەند دوراییەکی ئیقلیمیو دەولیشی بۆ دروست بوە»بۆیە دەبێت کورد «یەکگرتو پلانێکی هەمە لایەنەی هەبێت بۆ بردنەوەی دڵو عەقڵی کەرکوکییەکان». دەقی دیدارەکە لە لاپەڕەکانی (٦ و ٧) دا بخوێنەرەوە.

*** دەتوانین بڵێین ئێستا پرۆسەی چاکسازی لەناو یەکێتی دەستی پێکردوە؟**

- بەڵێ دەتوانین.

*** دەرکەوتەکانی چین؟**

- پرۆسەی چاکسازی کودەتای سەربازیو جەنگی نییە بەشەو و رۆژێك بتوانی رادیۆو تەلەفزیۆنو پایتەخت داگیر بکەیتو ئاڵوگۆڕ لەدامودەزگاکانی حکومەتو حیزبەکەدا بکەیت. پرۆسەی چاکسازی پرۆسەیەکی تەدریجییەو هەنگاو بەهەنگاو بۆ پێشەوە دەڕوات. ئەوەی کە ئێمە دەستمان پێ کردوە لە گرنگترین دامودەزگای یەکێتییەوە دەستمان پێ کردوە کە بریتییە لە یەکە رێکخراوەییەکانی یەکێتی، بریتییە لە رێکخستنی یەکێتی. لە راستیدا رێکخستنی یەکێتی وەکو دڵی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە. کە دەستمان پێ کردوە چەند هەفتەیەکی دەوێ تاکو ئەوە تەواو دەکرێت، پاش تەواوکردنی ئەوە، هەنگاوی دوەم ئینجا

بەرەو دامودەزگاكانی تر دەچین.

*** لەو پرۆژەیەی ئێوە سەرەقەڵەمە سەرەكییەكانیتان بڵاوكردەوەو دوایش لە چاوپێكەوتنێكدا باسی ئەوەتان كردوە كە مەبەست ئەوەیە یەكێتی ببێتە حیزبێكی سۆسیال دیموكرات. پێت وانیە كاتێكی درەنگ بێت بۆ سۆسیال دیموكراتی؟**

- نەخێر، هەندێك دیاردە هەیە لەناو یەكێتیدا پەیوەندی بە هەلومەرجی بابەتییەوە هەیە. ئێمە لەسەردەمێكدا كارمان كردوە كە هێشتا رژێمی بەعس لە سەر كار بو، هێشتا مەترسی پەلاماردانی بەعس لەسەر ناوچەكەی ئێمە هەبوە، هێشتا مەترسی هەندێك تاقمی تیرۆریستی لەسەر ناوچەكەی ئێمە هەبوە. هەندێك دیاردە هەیە لەناو یەكێتیدا هەلومەرجە بابەتییەكە دروستی كردوە، واتا هەلومەرجی خۆیی یارمەتی داوە بۆ ئەوەی كە دروست ببێت، ئەوە لەو بابەتانەیە كە پەیوەندی بەو پرسیارەی تۆوە هەیە.

*** لەو كۆنگرەیەی كە بەڕێز مام جەلالو جەنابتو برادەرانی تری مەكتەبی سیاسی تێیدا بەشداربون، ئیشارەتتان بەوە نەكرد كام پرۆژەیە بۆ چاكسازی یەكێتی پەسەند كراوە، بەڵام هەركەسێك بیخوێنێتەوە بەتایبەت لە هەیكەلی رێكخستنو دیوانی لێپرسینەوە، هێڵە سەرەكییەكانی ئەو پرۆژەیەن كە ئێوە بڵاوتان كردەوە، ئایا پێشبینی بكەین لە هەیكەلی دامەزراوەكانی دیكەشدا هەر پرۆژەكەی ئێوە پێش دەكەوێ؟**

- من شانازی دەكەم بەوەی كە پرۆژەیەك بێت، بیرە سەرەكییەكانی من هێنابێتمە كایەوە، لەراستیدا بەشێكی هی منە، ئەو پرۆژەیە نزیكەی دو مانگ لەگەڵ مەكتەبی رێكخستنو لەگەڵ ژمارەیەك لە كادیرە شارەزاكانی ناو رێكخستنەكانی یەكێتی گفتوگۆمان لەبارەوە كردوە. ئەگەرچی من پرۆژەكەم بەناوی خۆمەوە هێنایەكایەوە، بەڵام ئەو پرۆژەیە دەیان كەس بەشداریان كردبو لە نوسینی، بەڵام ئەمجارە وتم ئەگەر خراپ بێت ئۆباڵی خراپییەكەیو تێكشكانەكەی بكەوێتە سەرشانم، ئەگەر باشیش بێت ئەوە هەمومان سودی لێ وەردەگرین. پرۆژەكانی تریش هەروایە. كۆمەڵێكی زۆر پرۆژە نوسراون، كۆمەڵێكی زۆر وتار نوسراون، لەراستیدا هەموی بەنەفەسێكی زۆر گرنگ نوسراون كە ئەویش چاكسازییە لەناو یەكێتیدا. ریفۆرمە، پاكسازییە. هەر یەكە لە روانگەیەكەوە بۆی چوە، هەریەكە بیروبۆچونێكی هەیە بە مەجموع هەموی شتی زۆر زۆر باشن، بەڵام هەندێكیان دەچنە

قاڵبی قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و وەعزو نەسیحەتەوە. هەندێکی تری دەچێتە قاڵبی ئەوەی کە رواڵەتی کارەکەی گرتوە نەك جەوهەری. هەندێکی تریشی دیارە زۆرشتی باشی تێدایە کە گرنگ بێت، بۆ ریفۆرمێکی گشتلایەنە پێویست بەوە دەکات ئێمە کەڵك لە هەمو ئەو شتانە وەربگرین.

*** تێبینی دەکرێت هەم دروستکردنی دیوانی لێپرسینەوە هەم گۆڕینی هەیکەلی ریکخستن گۆڕانێکی بنەڕەتیین لەناو هەیکەلی یەکێتیدا، راستە وەک بەرێزت وتت گفتوگۆتان لەگەڵ کادیرەکان کردوە و پێش ئەوە بیروڕایان وەرگیراوە، بەڵام ئایا پێویستی بەوە نەدەکرد جۆرێک لە تەفویزی دیموکراتی بۆ ئەم گۆڕانە بنەڕەتییە هەبێت؟ بۆ نمونە لە چوارچێوەی کۆنگرەیەکدا؟**

-دەکرا، بەڵام ئیشەکان زۆر دوادەکەوتن. دوای ئەوە تۆ مەبەستت لە تەفویزی دیموکراتی چییە؟

*** مەبەستم بچێتە ناو کۆنگرەو لە کۆنگرەوە بڕیاری لێ بدرێت؟**

- کاك ستران، ریفۆرم هەمیشە سێ شێوازی کارکردنی هەیە، یەکێکیان ئەوەیە لەسەرەوە تۆ بڕیار دەدەیت، وڵاتانی دنیا ناوەندی لێکۆڵینەوەیان هەیە پاش لێکۆڵینەوەو دیراسە، ئەوانە شتێك گەڵاڵە دەکەن و لەسەرەوە حیزبەکە یان حکومەتەکە بڕیاردەدا کە زنجیرەیەك ریفۆرم بکرێت بێ ئەوەی راپرسی بکات لەناو خەڵکدا. هەندێك ریفۆرم فەوقییە، واتا لەسەرەوەیە. جاری وا هەیە سەرەوە گیر دەخوات و ئامادە نییە ریفۆرم و گۆڕانکاری بکات، لەخوارەوە ریفۆرمەکە دەبێت. زۆر جار ئەو ریفۆرمانەی لەخوارەوە دەبێت تێکەڵاو دەبێت بە جۆرێك لە توندوتیژیو بە خۆپیشاندان وبە مانگرتن، تێکەڵاوە بەو ئامرازانەی کە جۆرێك لە گوشار دروست دەکات بۆ سەر سەرکردایەتییەکە، جاری واش هەیە کە ریفۆرم دەبێتە پێویستییەکی بابەتیی، هەمو کەس هەستی پێدەکات. دەشێ بڵێین ئەمەیان بەهاوکاری لەنێوان سەرەوەو خوارەوە دەبێت و کارەکە ئەنجام دەدرێت، ئەوەی ئێمە کردومانە تا ئاستێکی زۆر لەو بابەتەیە: مەکتەبی سیاسی لەنێوان دو کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتیدا بەرزترین دەسەڵاتە، لەنێوان دوکۆنگرەشدا بەرزترین دەسەڵاتە. لەبەرئەوە هەندێك شت هەیە پێویست بەوە ناکات ئێمە چاوەڕێ بکەین. مەعلوم نییە شەش مانگی تر، ساڵێکی تر کەی کۆنگرە ئەبەسترێ؟ چونکە هەندێك شتی ئانی لەو روداوانەی لە کوردستانی عیراقدا هاتونەتە پێشەوە پێویست

بەوە دەکات بەبێ ئەوەی بیخەیتە کۆنگرە پێویستی بەگۆڕین هەیە. بۆ نمونە لێپرسینەوە لەوانەی کە تۆمەتبار دەکرێن بە دەوڵەمەندبونی ناڕەوا، ئەوە چ پەیوەندییەکی بە کۆنگرەوە هەیە، بەپێچەوانەوە پێش کۆنگرە دەبێت ئەوە ئامادە بکەی بۆ ئەوەی بزانین کە باسی پاکسازی دەکەن لەو ڕێگەیەوە پاکسازی دەکرێت.
من لایەنگری ئەوەم. دیوانی لێپرسینەوەیە کە دروست کراوە تەنیا بۆ ئەندامەکانی یەکێتییە، هیچ پەیوەندییەکی بەغەیری یەکێتییەوە نییە، بۆ نمونە خەڵك پێمان دەڵێ بۆچی ئەمانە لە وەزیرێك یان کارمەندێکی حکومەت بپرسنەوە، لەبەرئەوەی بەشێك لەو وەزیرو بریکارو بەڕێوەبەری گشتیو ئەندامانەی پەرلەمان، چ لەبەغداو چ لە کوردستان یەکێتی پاڵاوتونی، یەکێتی لەڕوی سیاسییو ئەخلاقییەوە لەبەرامبەری خەڵك جۆرێك لەئیلتیزامی هەیە بەرامبەریان. دەبێت بەرگریان لێ بکاتو لێپرسینەوەشیان لەگەڵدا بکات. واتا لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەو قسەوباسانەی کە لەسەر هەندێك کەس هەیە ناراست بو پێویستە یەکێتی بەرگری لێ بکاتو بڵێ ئەوە ناراستەو پڕوپاگەندەیەکی دوژمنانەیە بۆی دروست کراوە. ئەگەر ڕاستیش بو سزای پێویستی بدات، واتا دیوانی لێپرسینەوە ناچێت کەسێك ئەندام نەبێت لە یەکێتیی نیشتمانییدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات، بەڵکو تەنیا بۆ ئەندامەکانی یەکێتی خۆیەتی، ئەندامەکانی خۆیشی وەکو باسم کرد لەبەرئەوەی ئیلتیزامێکی ئەخلاقیمان هەیە بەرامبەر بەخەڵك. هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان بوە، یەکێتی خۆی لیستی دروست کردووەو پاڵێوراوەکانی خۆی پێشکەش کردوە، هەڵبژاردن بوە لەبەغدا بەهەمان شێوە، بۆ ئەنجومەنی پارێزگا بەهەمان شێوە، لەشارەوانییەکان، ئەو وەزیرانەی چ لە بەغداو چ لەهەولێر پاڵێوراون مەکتەبی سیاسی جۆرێك لەئیلتیزامی ئەخلاقیو ئەدەبی هەیە بەرامبەر بە کۆمەڵانی خەڵکیشو بەرامبەر وەزیرەکانیش، بۆیە لەسەر ئەویشە پێش هەمو کەسێکی دیکە لێپرسینەوە بکات. بە تایبەتی لەبەرئەوەی لە دەدوانزە ساڵی ڕابردودا دامودەزگاکانی حکومەت ئەوەندە لاواز بون، نەیانتوانی وەکو پێویست لێپرسینەوەی پێویست لەگەڵ کاربەدەستەکانی بکات، هەتا ئەو زەمانەی ئەوان ئەو کارە دەکەن، پێویستە حیزبەکە خۆی بیکات.

***لەدەقی دیوانی لێپرسینەوە دەڵێ مەکتەبی سیاسیی دەتوانێ کار بەو.**

**مەلەفە نەکات، ئایا مەبەستو مەغزا لەوە چییە؟ ئەگەرکەسێک شتێکی لەسەرساغ بێتەوە مەکتەبی سیاسیی بۆچی هەڵیدەپسێرێو چارەسەری ناکات؟ ئەوە زۆر رون نییە ئەگەر رونکردنەوەی زیاترتان هەبێت.**

-لەهەمو جێگایەکی دنیادا هەیە، کە دادگاش بڕیاری شتێك دەدات جاری واهەیە جێبەجێکردنەکەی رادەگرن، ئەوەی بەعەرەبی پێی دەڵێن «وقف التنفیذ». ئەم کارە زۆر ئاڵۆزە، بۆ نمونە باسی بکەم، ئومێدم وایە رۆژێك لەرۆژان هیچ ئەندامێکی ئێمە نە لەپەرلەمانو نە لەبەغداو نە لەکوردستان نەکەونە بەرلێپرسینەوە، بەڵام هەمو ئەندامێکی پەرلەمان کە هەڵبژێردراوە راستە یەکێتی پاڵاوتویەتی، بەڵام لەهەمان کاتدا خۆی جۆرێك لەحەسانەی پەرلەمانی هەیە. هەتا حەسانەی پەرلەمانی لێ نەسەنرێتەوە ناتوانی هیچ ئیجرائاتێکی لەگەڵدا بکەی، لەو حاڵەتەدا ناتوانی ئەندامێکی پەرلەمان بانگ بکەی بۆ لێپرسینەوە ئەگەر خۆی ئامادە نەبێت، ئەگەر سزاشی بدەی سزاکەی رادەگیرێت تا کاتەکەی تەواو دەبێت، یاخود پەرلەمان حەسانەکەی لێدەستێنێتەوە، ئەوە نمونەیەکە کە لەروی تەکنیکییەوە دەتوانی بڵێی رێگرە. هەندێکی تری هەیە رەنگە هۆکاری سیاسی هەبێت کە ببێتە رێگرو تۆ نەتەوێ لەوکاتەدا هەندێك لەو شتانە ئاشکرابکەی، لەوانەیە کاریگەری هەبێت بۆ سەر هەڵبژاردن.

*** واتا ئەوە لەبەر حیزبەکەیە نەک لەبەر کەسەکە؟**

- بەڵێ ئەوە لەبەر حیزبەکەیە.

*** یەکێتی لەمێژوی سیاسی خۆیدا چەند جارێک پێداچونەوەی بە بەرنامەی خۆیدا کردوەو بەرنامەی تازەی داناوە، ئەم پرۆژەیەش گۆڕانێکی بنەڕەتی لەناو یەکێتی دروستدەکات، ئایا چ وەختێک دەتوانین دڵنیابین لەوەی یەکێتی دەگاتە قۆناغێک پێویست بەوە نەبێت هەر دە ساڵ جارێک پرۆسەی چاکسازی تێدا بکرێت، واتا میکانیزم هەبێت کە ناچارنەبێت هەر دە ساڵ جارێک لێپرسینەوە لەگەڵ گەندەڵ ولادەرەکان بکات؟ مۆدێلی سیاسی پەسەندکراو بۆ یەکێتی چۆن دەبێت بەرای ئێوە؟**

- دو مەسەلەی گرنگ هەیە، کە دەبنە گرەنتی بۆجێبەجێکردنی ئەوە یەکێکیان هەڵبژاردنەوەی دەوریی ئۆرگانەکانی یەکێتییە. بەگوێرەی ئەو پرۆژە تازەیەی وادانراوە هەمو ئۆرگانەکانی یەکێتی لەپۆلەوە تادەگاتە سەر مەڵبەند هەر ١٨- ٢٤ مانگ جارێك واتە لەساڵو نیوێك تا دو ساڵ بەهەڵبژاردن تازە ببنەوە. لەهەمان کاتیشدا کاتی خۆی بڕیار دراوە هەردو ساڵ جارێك کۆنگرە ببەسترێ.

ئەگەر ئێمە بتوانین ئەوە دەستەبەر بکەین دو ساڵ جارێك هەمو ئۆرگانەکانی یەکێتی لەپۆلەوە تادەگاتە مەڵبەند بەهەڵبژاردن تازەی بکەینەوەو هەمو دو ساڵ جارێك بتوانین لەوادەی خۆیدا کۆنگرە ببەستین، من باوەڕم وایە پێویستمان بەوە نابێت.

***ئەو میکانیزمە زانراوە کە دوساڵ جارێک کۆنگرە ببەسترێ، بەڵام کە یەکێتی پابەند نەبو پێیەوە؟ چۆن دەتوانرێ کەشێکی سیاسیی وەها تەندروست هەبێ کە هەڵبژاردن و کۆنگرە بکرێت؟**

- رەنگە، دواکەوتنی کۆنگرە بەشێکی پەیوەندی بەو گۆرانکارییانەوە هەبوە کە لەکوردستانی عیراقدا رویانداوە، ئەگینا من پێموانییە کە سەرکردایەتی یان مەکتەبی سیاسی یەکێتی ئەوەندە بتوانێ بەپێچەوانەی ئارەزو وبەپێچەوانەی ویستی زۆرایەتی ئەندامەکانی خۆی کاربکات، ئێمە لەماوەی گرتنی کۆنگرەی دوەمەوە هەتاکو ئێستا بەسەریدا رژێمی بەعسی روخاوە، بەسەریدا چەند هەڵبژاردنێك کراوە، بەسەریدا دەستوری عیراق نوسراوە، بەسەریدا هەڵبژاردن لەکوردستان کراوە، بەسەریدا یەکێك لەشتە گرنگەکان ئەوەیە کە کورد لەبڕیاردانی سیاسی دەوڵەتی عیراقدا جێگەی خۆی بکاتەوە، کۆمەڵێك لەومەسەلانە بونەتە هۆی ئەوەی ئەولەویاتی خۆت بگۆڕی. جاری واهەیە ئەولەویەت بۆئەوەیە تۆ کۆنگرە ببەستی، جاری واهەیە نەخێر ئەولەویەت بۆ نوسینەوەی دەستورە،بۆ بردنەوەی هەڵبژاردنە، لەبەرئەوە تۆ ناتوانی هەمو ئەو کارانە لەیەککاتدا جێبەجێبکەی. یەکێکیان دەکەی بەیەکەمین، ئێمە لەو قۆناغانەی پێشودا یەکەمینمان بریتی بوە لەو کارانە. ئێستا حاڵی حازر کە زۆری ئەوکارانە بەلایەکدا کەوتون یەکەمینمان بۆ چاککردنی پەیکەری رێکخراوەیی یەکێتیو گرتنی کۆنگرەو بەردەوامبونە لەسەر ئەوەی هەمو جارەکان لەوادەی خۆیدا هەڵبژاردنەکان بکرێت، ئەگەر ئێمە بتوانین لەوادەی دیاریکراوی خۆیدا بەگوێرەی پەیڕەوی ناوخۆ هەردو ساڵ جارێك هەڵبژاردن لەناو مەڵبەندەکاندا بکەین و هەردو ساڵ جارێکیش کۆنگرە ببەستین، من پێم وایە پێویستمان بەوە نابێت دە ساڵ چاوەڕێ بکەین بۆ ئەوەی دیوانی لێپرسینەوەو شتی لەو بابەتە دروست بکەین.

***جیهازی رێکخستن هەڵبژاردنی تێدا دەکرێ و مەڵبەندەکان دەبنە مەڵبەندی قەزاکان و جۆرێک لەدەسەڵات دەدرێتە ئەو مەڵبەندانە، بەڵام هەست ناکەی هەر قەزایەک مەڵبەندێکی تێدا بکرێتەوە جیهازی**

**بیرۆکراسی حیزب گەورەتر دەبێت؟**

- نەخێر، لەبەرئەوەی دیاریکراوە، وەکو جاران نییە بۆ نمونە ئێمە لەشوێنی وا هەیە ئەندامەکانی مەڵبەند کە دایانناون بەتەعین و بۆ رازیکردنی دڵی خەڵك‌و بۆ ئەوەی موچەیەکیان بۆ دابینبکەن، (١٣٠) کەسن کەخۆی لەراستیدا بەگوێرەی پەیڕەوی ناوخۆ دەبێ لەژمارەیەکی دیاریکراو تێنەپەڕن. لەبەرئەوەی لەو ماوەیەدا هەلومەرجێکی نائاسایی هاتۆتە پێشەوە تارادەیەکی زۆر پەیڕەوی ناوخۆ فەرامۆشکراوە.بەمەی کە تۆ لایەنی زۆری ئەندامانی مەڵبەندەکانت داناوە بە (٩) کەس: بەرپرسی مەڵبەند دەبێت، جێگری یەکەم و جێگری دووەم دەبێت لەگەڵ (٢-٦) کارگێڕ. رەنگە لەئایندەیەکی نزیکیشدا مەڵبەندەکان پۆلێن بکرێن بە سێ جۆرەوە وەك چۆن شارەوانییەکان سێ جۆرن. رەنگە مەڵبەندەکانیش پۆلێن بکرێن بۆ نمونە مەرکەزی سلێمانی‌و هەولێرو کەرکوك‌و دهۆك ئەمانە لەپۆلی (A) بن، ئەوانەی لەوانە پچوکترن، بەڵام لە هەندێك قەزا گەورەترن لەبابەتی رانیە، کەلارو کۆیە دەتوانی‌پۆلی(B) دایان بنێی. هەندێکی تر کە ژمارەی نفوسی دانیشتوانی کەمە دەتوانی بیخەیتە پۆلی (C)یەوە.یەکەمیان بۆی هەیە ٩ ئەندام مەڵبەند بێت بە بەرپرسەکەوە، دووەمیان بۆی هەیە بەنمونە شەش بن، ئەوەی تریان بۆی هەیە چوار یان پێنج بێت.

***بەڵام سەلاحیەت‌و ئیعتیباری سیاسییان هەمان شتەو وەکو یەکە؟**

-بەڵێ نەفسی شتە، چونکە لەروی ئیدارییەوە مادام ئەو قائمقامی هەیەو مودیر ناحیەی هەیە یان دەبێ لەغوی بکەی یان دەبێ هەمان مامەڵەی لەگەڵدا بکەی. بەڵام لەکۆنگرە هەمان مامەڵەی لەگەڵدا ناکەی. لەکۆنگرە بەگوێرەی زۆری‌و ژمارەی ئەندامەکانی لەو قەزاو ناحیانە ژمارەی نوێنەرەکانیان زۆرتر دەبێت.

*** لە هەر گۆڕانێکی سیاسیی یان بەحوکمی دەستکاری هەیکەلەی حیزبی کۆمەڵێک خەڵک زەرەرمەند دەبن، نەک لەبەرئەوەی ئەو خەڵکانە موحاسەبە دەکرێن ئەوە فایلێکی جیایە، بەڵکو بۆ نمونە خەڵکێک دەرناچێتەوە لەهەڵبژاردن یان خەڵکێک بەر جادەی چاکسازی حیزبی دەکەوێ، (١٣٠) ئەندام مەڵبەندت هەیەو کەم دەکرێنەوە، یەکێتی چ میکانیزمێکی هەیە بۆ چارەسەری ئەو مەسەلەیە؟**

- یەکەم موچە پەیوەندی بەئێمەوە نییە، موچە پەیوەندی بەدارایی‌و ئابوری‌و حکومەتەوە هەیە، ئەوە لایەنی موچە، لایەنەکەی تریشی ئێمە لەبیرمانە کە لەهەمو مەڵبەندێکا

جێگەیەکی تایبەتی تەرخان بکەین بۆ ئەو ئەندامانەی یەکێتی کە نە لە کەرتدان، نە لەپۆلدان، نە لەکۆمیتەو مەڵبەنددان. ئێمە ژمارەیەکی زۆر ئەندامیمان هەیە بۆ نمونە کۆنە وەزیر، کۆنە ئەندام پەرلەمان، کۆنە ئەندامی مەڵبەندو سەرکردایەتی ومەکتەبی سیاسییە،پێشتر لەیەکێك لەو پۆستانە بودو ئێستا ئەو پۆستە نەماوە جا یان بەئارەزوی خۆی یان دەرنەچود. ئەمانە لەشکرێکی گەورەن بۆ پشتیوانیکردن لەیەکێتی. لەهەمو هەڵبژاردنێکدا رۆڵی زۆر گرنگیان هەیە چ لەهەڵبژاردنی گشتی، چ لە هەڵبژاردنی رێکخراوە پیشەییەکانداو کاریگەری زۆریشیان هەیە. لەهەمو مەڵبەندێکدا جێگایەکی تایبەتی بۆ ئەوانە دانەنرێتو ئەوان دەتوانن لەنێوان خۆیاندا هەرچەند مانگ جارێك کۆببنەوەدو چەند کەسێك وەك نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن بۆ ئەوەی لەنێوان مەڵبەندەکەو سەرکردایەتیو ئەوان ببنە ئەڵقەی وەسڵ. لەهەمان کاتدا ئەوان دەتوانن چاودێری ئەوانەی مەڵبەندە تازەکە بن بزانن باش ئیش دەکات یان نایکات. هەرچی کێشەیەکیان هەبو هی خۆیان یان هی خەڵك دەتوانن لەرێگەی ئەو خەڵکانەوە کە دایاندەنێن بەنوێنەری خۆیان بیگەیەنن بەمەڵبەندو دەزگاکانی سەروتر، ئەگەرکێشەی تایبەتیخۆیشیان هەبو بەهەمان شێوە، لەهەمو هەڵبژاردنێکدا کە بکرێت ئەوانیش دەتوانن بەشداری بکەن چ بەدەنگدانو چ بە خۆپاڵاوتن.

***چۆن زامنی ئەوە بکەین کە دیوانی لێپرسینەوە نەبێتە دیوانی تەسفیەی حساباتی سیاسیی؟**

- ئەگەر یەکێك گەندەڵی نەکردبێت چۆن دەتوانی تۆمەتباری بکەی بە گەندەڵیو شتی لەسەر ساغ بکەیتەوە، ئەگەر خۆی شتێکی لەو بابەتەی نەبێت، جگە لەوەش ئەو کەسە بۆی هەیە شکات بکات. دەتوانێ لەمەکتەبی سیاسی شکات تۆمار بکات یان لەدادگا.

*** بەڵام دەگوترێ دیوانی لێپرسینەوە تەنیا بۆ لێپرسینەوە لەگەندەڵی داراییو ئیداریی نییە، بۆ لادانی حیزبیو شتی تریشە؟**

- بەڵێ دەرچونیش لەپەیڕەوی ناوخۆش بۆی هەیە لێپرسینەوەی لەسەر بکرێت ، بۆ نمونە کەسێك دەڕوات ئینشیقاق دەکات یان بەئاراستەی ئینشیقاق لەناو یەکێتی ئیش دەکات، ئەوە دەرچونە لەپەیڕەوی ناوخۆ. یەکێك بەپێچەوانەی پەیڕەوی ناوخۆو پرۆگرامی یەکێتی کاردەکات شکاتی لێدەکرێت یان لەمەڵبەندەکانەوە یان

هەتا گریمان، پۆلێك، كەرتێك، مەڵبەندێك لەرێبازی یەكێتی لادەدات مەكتەبی رێكخستن یان هەر مەكتەبێكی تر شكاتی لێدەكات.

*** ئایا فایلی شەڕی ناوخۆ دەبێتە بەشێك لە كارەكانی دیوانەكە؟ بۆ نمونە هاوڵاتییەك شكاتی لەفەرماندەیەك هەیە لەبەر هەندێك ئیعتباراتی پێشمەرگانە یان لەشەڕی ناوخۆ شتێكی لەسەر ساغ بێتەوە، ئەو مەسەلەیەش دەگرێتەوە؟**

- من پێموایە فایلی شەڕی ناوخۆ دابخەین باشترە، شەڕی ناوخۆ لەسەر مەسەلەی سیاسیی بوە، وەختێك ئێمە مەسەلە سیاسییەكانمان چارەسەركرد،ئەوەش دابخرێ. هیچ كەسێك لەیەكێتی نەڕۆیشتوە كەسێكی كوشتبێ لەبەر دوژمنایەتی شەخسی، كەسێكیش نەهاتوە لەیەكێتی كوشتبێ لەبەر دوژمنایەتی شەخسیو لەسەر مەسەلەی خانو، ژن یا پارە یان شتی لەو بابەتانە. ئێمەش شەڕەكەمان شەڕی سیاسی بوە ناكۆكی سیاسیمان هەبو. وەختێك ناكۆكییە سیاسیەكەمان بەلاداهاتو چارەت بۆ دۆزییەوە، بۆ ئەوەی برینەكان سارێژ بن پێویستە ئەو فایلە دابخرێتو دەرگای تۆڵەكردنەوەو شكات كردنو ئەمانە نەمێنێ، چونكە یەك دەرگات كردەوە لەسەر شكاتێك بەدوای خۆیدا سەد دەرگای تر دەكاتەوە.

*** لە پرۆژەی چاكسازی شوێنی گەنج دیار نییە، ئێوەش بەوە دەناسرێن پشتیوانی گەنج دەكەن، لەم پرۆژەیەی یەكێتیدا چۆن شوێنی گەنج بدۆزینەوە؟**

- جاران ئەندامێتی لەیەكێتی لە ١٨ ساڵ بەرەو ژور بو ئێستا مەرجی ئەندامێتیمان گۆڕیوە لە ١٦ ساڵ بەرەو ژور. بەوەی كە هەمو پۆلەكان لەسەرتاسەری كوردستاندا هەڵبژاردن دەكەن بۆ ئەوەی لێپرسراوی پۆلەكەو جێگرەكەی هەڵبژێرن، دوای ئەوە بەرپرسی پۆلەكەو جێگرەكانیان بەشداری دەكەن لەهەڵبژاردنی بەرپرسی كەرتو جێگری یەكەمو دوەمو بەرپرسی كەرتو جێگری یەكەمو دوەمی بەشداری دەكات لەهەڵبژاردنی لێپرسراوی كۆمیتەو جێگری یەكەمو دوەمیو لەدواییشدا هەمویان پێكەوە بەرپرسی پۆل، بەرپرسی كەرتو جێگری یەكەمو دوەمی، بەرپرسی كۆمیتەو جێگری یەكەمو دوەمی بەشداری دەكەن لەهەڵبژاردنی لێپرسراوی مەڵبەندو جێگری یەكەمو دوەمی لێپرسراوی مەڵبەندو لەهەڵبژاردنی كارگێڕەكانی مەڵبەندا. دوای ماوەیەكی تر

هەڵبژاردن بۆ کۆنگرەش دەکرێ. کە هەڵبژاردن بۆ کۆنگرە کرا هەمو کەس بۆی هەیە خۆی بپاڵێوێ بۆ کۆنگرەو هەمو کۆمیتەکانیش بەجیاجیا وەکو بازنەیەکی هەڵبژاردنی تایبەتی رەفتاری لەگەڵدا دەکرێت. گەنجەکان لەوەدا دەتوانن بێنە پێشەوە: هەم لەپۆلەکان و لەکەرتەکاندا دێنە پێشەوە و هەم دەتوانن لەو هەڵبژاردنانەدا بێنە پێشەوە، ئەو دەرگایەمان بۆکردونەتەوە بۆئەوەی گەنج لەوێوە بێتە پێشەوە. من خۆم باوەرم بەوە نییە ئێمە لە سەرکردایەتی یەکێتیدا کۆتاییەك دابنێین، بەشێك دابنێین بڵێین ئەمە بۆ گەنجە، گەنجێتیو پیرێتی بەجۆری بیرکردنەوەیە و بەتەمەن نییە، بەڵام ئەوەی کە ئێستا پۆلەکان بون بەهێزێکی کاریگەرو بڕیاردەر لەهەڵبژاردنی مەڵبەندەکانو نوێنەرەکانی کۆنگرە، پێم وایە لەوەدا گەنج هەلێکی باشتری بۆ رەخساوە بۆ ئەوەی بێتە ململانێوە لەگەڵ نەوەکانی پێش خۆییو لەخۆی گەورەتر.

*** چۆن زامنی ئەوە بکەین کە ئەو هەڵبژاردنانەی ئێستا تەکەتولاتی تێناکەوێ؟ چەند قۆناغمان پێویستە ، قۆناغی نەقاهە، بۆ ئەوەی یەکێتی لە قۆناغی تەکەتولەوە بۆ قۆناغی ململانێی تەندروستی هەڵبژاردن دەربچێ؟**

- من ئەوە نازانم چۆن دەکرێ؟ دوای ئەوە تەکەتولات ئەگەر هەندێك جار لەسەر بنەمای سیاسییو فیکری بێت، بۆ جێبەجێکردنی ئامانجێکی سەرەکی بێت لەناو یەکێتیدا شتێکی ئاساییە.

*** مەبەستمان تەکەتولە بەو شێوەی لە ناو یەکێتی باوە: گروپگروپێنە.**

- تەکەتول بۆ مەحسوبیەتو بۆ شتی خراپ، ئێمە بەگوێرەی سەرژمێرییەك کە مانگی شوباتی ئەمساڵ بەشی ئاماری مەکتەبی رێکخستن کردویەتی یەکێتی پەنجا هەزار پۆلی هەیە، من باوەر ناکەم هیچ تەکەتولێك بتوانێ پەنجا هەزار پۆل قەناعەت پێبکات بۆ شتێکی دیاریکراو یان بەرتیلی بداتێ.

*** باسی ئەوەت کرد هەندێک لەو پرۆژانەی پێشکەش کراون لەلایەن هەڤاڵانی ترەوە، تەنها وەکو وەعزو قسەی نەستەقن و شتی گشتیان تێدا باسکراوە، ئایا ئەوانە تەنها مەبەستیان ئەوە نەبوە خۆیان لە مەسەلەی چاکسازی لابدەن؟**

- من قسەی واناکەم، بەڵام بۆ نمونە کەسێك بۆت باس دەکات دەڵێ ئەم وڵاتە گەندەڵی تێدایە، دەبێ گەندەڵی بنبڕبکرێ، دەبێت بەگژیدا بچینەوە، بەڵام میکانیزمی بەگژداچونەوەو نەهێشتنی

گەندەڵی دەستنیشان نەکردوە، سەرەڕای ئەوەش پێناسەی گەندەڵی نەکردوەو رونی نەکردۆتەوە کە مەبەستی لەگەندەڵی چییە؟ هەمو کەس باسی گەندەڵی دەکات بەڵام بابێین وردبینەوە بزانین مەبەست لەگەندەڵی چییە، نابێ بزانین گەندەڵی لەچیدایە، گەندەڵی لەکۆمەڵێك شتدا خۆی دەنوێنێ کە دەبێ دیاری بکرێ، دەبێ رێگەچارەشی بۆ دەستنیشان بکرێت، ئەگینا تا ئێوارە هەرباسی ئەوەبکە بڵێ گەندەڵی شتێکی خراپە دەبێ لەناوی ببەین. هەمو کەس ئەوە دەزانێ. ئەوە مەشهورە دەڵێن جارێك دو کەسی نەخوێندەوار چونەتە ژوری مامۆستایەکی ئاینی لەیەکێك لەدێهاتەکانی کوردستاندا، ژورەکە پڕبوە لەکتێب لە مەلاکەی پرسیوە ئەو کتێبانەت هەمو خوێندۆتەوە؟ مەلاکە وتویەتی ئەوەڵا هەمویم نەخوێندۆتەوە، ئەویش وتویەتی ئەو کتێبانە هەمویان باسی چی دەکەن؟ مەلا وتویەتی ئەمانە کتێبی جیاجیان ،ئەمەیان باسی حەدیس دەکات، ئەوەیان باسی تەفسیر دەکاتو ئەوی تریان باسی مێژو دەکات.دەڵێ نەخێر نەتزانی، من دەزانم باسی چی دەکات، دەڵێ باسی چی دەکات؟ دەڵێ هەمویان دەڵێن چاك بکەو خراپ مەکە!لەراستیشدا هەروایە دەتوانی کورتی بکەیتەوە، بەڵام راستو خراپ مەکە دوایی دەبێ وردی بکەیتەوە لەتەفسیردا چی دەڵێ؟ لە حەدیسدا چی دەڵێت؟ لەمێژودا چی دەڵێت ولە زانستەکانی تردا چی دەڵێت؟ ئەگینا تۆ بەوە کورتی بکەیتەوە هەمو کەس دەڵێ بەڵێ گەندەڵی خراپە، بەڵام چۆن بنبڕی دەکەی؟

*** پرۆسەی چاکسازی سەرەتا لە مەکتەبی رێکخستنەوە دەستی پێکردوە، دەتوانین بڵێین زۆربەی کەموکورتییەکانی یەکێتی لەناو مەکتەبی رێکخستندا بوە؟**

- من بەپێچەوانەوە دەڵێم یەکەم دەنگ لەناو هەمو یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا کە بەرزبۆوە داوای چاکسازی کرد لەناو یەکێتیدا، لەمەکتەبی رێکخستندا بەرزبۆتەوە. ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی کە لەهیچ رۆژنامەو شوێنێکی تردا باسی بکرێت یەکەم تاقم لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا کە داوایان کردبێت چاکسازی بکرێتو بەوردیو بەراپۆرت نوسیبێتیان بۆ سکرتێری گشتیو بۆ مەکتەبی سیاسی ئەوان بون.باسی ئەوەیان کردوە کە یەکێتی پێویستی بە چاکسازی هەیە.

*** بەڵام ئێستا یەکێتی تەنیا حیزبی بەدەنی حیزبی نییە، هی**

**رێکخستن نییە بەتەنیا، حیزبێکی جەماوەری فراوانە، قۆناغی داهاتو لەکارکردنی چۆن دەبێت؟**

- ئاخر کاکە رێکخستن سەبارەت بەوەی کە پەیوەندی لەگەڵ زۆر لایەنی جیاجیا هەیە، مەکتەبی رێکخستن پەیوەندیان لەگەڵ قاعیدەی یەکێتی و لێپرسراوانی یەکێتیدا هەیە، لەگەڵ کاربەدەستەکانی کە یەکێتی دایناون لەقەزاو ناحیەکاندا لەگەڵ هەمو ئەوانە تەماسی هەیە. دەبینێ چۆن زەوی دابەش دەکرێت؟ دەبینێت چۆن خەڵك تەعین دەکرێت، دەبینێت چۆن خەڵك دەپاڵێورێت بۆ دامودەزگا جیاوازەکانی حکومەت؟ خەڵك هەمو ئەو شتانە دەبینێو قسەدەکات ئەوان لێکۆڵینەوەیان لەو شتانە کردوە لەئەنجامی ئەوەدا داوایان کردوە کە بەڵێ ئێمە پێویستمان بە چاکسازی هەیە، ئەگینا ئەوە نییە بڵێی ئەوان لەدەزگاکانی تر خراپترین، بەپێچەوانەوە ئەوان ئاڵا هەڵگری چاکسازی بون.

*** دوای ئەوان کێی تر دێت، قۆناغی دوای رێکخستن، راگەیاندن، رێکخراوە دیموکراتییەکانی تێدایە، ئێوە دوای دیوانی لێپرسینەوەو دوای مەکتەبی رێکخستن دێنە سەرچی؟**

- ئێمە تا شتێك تەواو نەکەین ناچینە سەر شتێکی تر، واتا ناکرێ شتێك دەستی لێوەبدەیتو بیئاڵۆزێنی پێش ئەوەی بەئەنجامی بگەیەنی. بۆ نمونە ئێمە هەتا ئێستا لە دیوانی لێپرسینەوە نیزامە داخلیە قانونییەکەیمان تەواو نەکردوە کە بزانین هەیکەلەکەی چۆن دەبێت؟ ئەوەشمان دەستنیشان نەکردوە کە چۆن دەبێتو چۆن نابێت؟ ئێمە دو ئیشمان دەستپێکردوە یەکێکیان ئەو دیوانەیەو ئەوی تریان هەڵبژاردنە، پێویستە لە (١/٧)ەوە خەریك بن. دەزگای هەڵبژاردن وئەوان لەروی تەکنیکییەوە ئێستا ئیشەکانیان تەواو کردوە وتەعلیماتیان نوسیوەو حیسابیان کردوە پێویستیان بەچەند کەسە بۆ چاودێری، پێوستیان بە چەند دادوەرە، پێویستیان بەچەند مەرکەز هەیە، پێویستیان بەچەند پارە هەیە، هەمو ئەوانەیان تەقدیر کردوەو رێنماییو شتەکانیان نوسیوە. ماوتەوە سەر ئەوەی کە دەستبکەین بەجێبەجێکردنی. رەنگە هەندێك ئیشکالی بچوك هەبێ کە لەوانەیە گفتوگۆی لەبارەوە بکەین بۆ ئەوەی بەلایەکدا بیخەین، لەسەر مەسەلەی ئامارو فۆرمو شتی لەو بابەتانە، بەڵام پێویستە لە (١/٧)ەوە دەستیان کراوەبێت بۆئەوەی بتوانن دەست بەپرۆسەی هەڵبژاردن بکرێت لەناو یەکێتیدا، ئەو پرۆسەیە پرۆسەیەکی دورودرێژە، ئەوە نییە بڵێین بە رۆژێكو دورۆژ تەواو

دەبێت. بەلایەنی کەمەوە لـە (٤٥) ڕۆژ تا (٢) مانگی دەوێت. ئێمە چاوەڕێ دەکەین تائەوانە جێبەجێبن، ئینجا بگوێزینەوە بۆ سەر شتەکانی تر، هێشتا ئەوانی ترمان هەڵنەبژاردوە کە لە کامیانەوە دەست پێبکەین؟.

***مەبەستمان ئەوەیە ئەو فایلانەی لەسەر کەسێک ساغ دەبێتەوە دیوانی لێپرسینەوە دەبێتە مودەعی لەسەر ئەو کەسە، یان یەکێتی شکاتی لێدەکات؟**

- لەم حاڵەتەدا لەڕاستیدا من نازانم، ئەوە شتێکی قانونییە، چونکە ئەوەی کە لەناو دیوانەکەدایە سێ کەسن. یەکێکیان سیاسییە. یەکێکیان یاساییە کە دامانناوە دەبێت لە دە ساڵ زیاتر ئەزمونی یاساییو شارەزایی یاسایی هەبێت. ئەو لیژنەیەی کە دامان نابو پەیڕەوی ناوخۆی یاسای دیوانەکە بنوسن داوای کردوە کە لە (١٥) ساڵ ئەزمونی هەبێ کەسی سێیەمیش شارەزایی چاودێری دارایی دەبێت، ئەویش پێشنیازیان کردوە کە (١٥) ساڵ ئەزمونی هەبێت لەو بوارەدا، ئەو دو کەسە واتە یاساییو شارەزای چاودێری داراییەکە هەریەکەیان سێ کەس لەبوارەکەی خۆیان هاوکاریان دەکات. بۆ نمونە یاساییەکە سێ قانونیی لەگەڵە کە لێکۆڵەرەوەن بۆ لێکۆڵینەوە لانی کەم هەریەکەیان دەساڵ ئەزمونی مافو یاسایان هەیە. ئەوەی داراییەکەش دەبێت سێ کەسی لەگەڵ بێت کە هەریەکەیان دەساڵ ئەزمونی چاودێری داراییو شتی لەو بابەتەیان هەبێت. بۆ ئەوەی ئیشەکان زۆر زۆر وردو دەقیق بن، چونکە ئەو مەسەلەیە زۆر حەساسە. تۆ دەتوانی بەیەك پروپاگەندەی خراپ سومعەی گەورەترین کەس بشکێنی، کەوەختێك پروپاگەندەکەت بڵاوکردەوەو کەوتە ناوبازاڕەوەو کەوتە سەر زمانی خەڵك دەجار ڕاستی بکەیتەوە هیچ نییە. لەبەرئەوە دەبێ ئەو دەزگایە زۆر پارێزگاری نهێنیو پارێزگاری تایبەتمەندی ژیانی خەڵك بکات. ئەگەر ئەو شتانە ناراستو درۆبون دەبێت دایخاتو جارێکی تر نەهێڵێت بڵاوبکرێتەوە نابێ بهێڵێ ئەوە بکەوێتە سەر زمانی خەڵكو بڵاوببێتەوە، چونکە ئیشی ئەو دەزگایە ناوزڕاندنی خەڵك نییە، بەڵکو گەیشتنە بەڕاستی.

***ڕەدی ئیعتیبار بۆ کادیرێک دەکرێتەوە کە بزانرێ تۆمەتی بۆ هەڵبەستراوە؟**

- بەڵێ. نەك هەر ڕەدی ئیعتیباری بۆ دەکرێت بگرە دیفاعیشی لێدەکرێت لەناو حیزبەکەولەناو خەڵکیشدا. یەکێك کە بەخۆڕایی

تاوانبار کرابێت، زۆر گوناهە لەپێشدا هەر نابێ باسی بکەی.

*** ئەو هەمو هەوڵانەی یەکێتی بۆ چاککردنی وەزعی خۆی، بەدەر لەوەی وەک سەرکردایەتی، وەک جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی‌و مەکتەبی سیاسیی، بەڵکو وەک کەسێک کە مێژو دەنوسی وچاودێری رەوتی سیاسیی دەکەیت، پێتوایە ترسێک هەیە کە یەکێتی نەتوانێ حیزبی قۆناغی داهاتو بێت؟ بۆ نمونە وەک دەستەی دامەزرێنەر کە یەکێتیتان دامەزراند بۆ کۆمەڵێک ئەرک دامەزرا لەوانە روخاندنی رژێم، زامنکردنی مافەکانی گەلی کوردستان، دەستوری کوردستان، دیموکراتی وفیدرالی بۆ عیراق، هەستدەکرێ هەمو ئەوانە هاتونەتە دی و وەکو بڵێی ئەرکی مێژویی یەکێتی تەواو بوە؟ واتە یەکێتی بۆتە قوربانی ئەو ئامانجانەی کە بەدیهێناون؟**

- من نازانم، ئێمە کە باسی چاکسازی دەکەین لەناو یەکێتیدا، بەمانای ئەوە نییە کە وەزعی یەکێتی زۆر خراپە، هەندێك جار زیادەڕۆیی تێدا دەکرێت، ئەگینا تاوەکو ئێستا یەکێتی هێزێکی گەورەو سەرەکی ناو گۆرەپانی سیاسی کوردستانی عیراقە. خۆ هەڵبژارکردنەکان هەموی چەند مانگێك پێش ئێستا بون، باشترین بەڵگە کە تۆ بەخەڵکی دەڵێیت وەرە بەشداری بکە لە هەڵبژاردندا بۆ دەنگدان لەسەر دەستورو دەنگدان لەسەر هەڵبژاردنی نوێنەری کورد لەپەرلەمانی عیراقدا، ئەوە خۆی لەخۆیدا باشترین تاقیکردنەوەیە بۆ ئەوەی کە هەتاوەکو ئیستا یەکێتی پایەیەکی زۆر فراوانی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا هەیە. کە تۆ باسی چاکسازی دەکەیت مانای وانییە وەزعی زۆر زۆر خراپ بێت، هەتا لە وڵاتانی پێشکەوتوی وەکو بەریتانیاو ئەمەریکاو فەرەنساو ئەڵمانیا کە وەختێك هەڵبژاردن دەکەن بەڵێن دەدەن بەخەڵك‌و دەڵێن ئێمە ریفۆرم دەکەین. چونکە کە تۆ ئەمساڵ یاسایەك دادەنێیت پاش پێنج ساڵی تر ژیان دەگۆڕێت لەو وڵاتەدا. بەگوێرەی گۆڕانی هەلومەرجی ژیان لەوڵاتدا پێویستی بەوە هەیە هەندێك دەستکاری بکەی لەیاساکاندا. دەستکاری بکەی لەباج، دەستکاری بکەی تەنانەت لەتەمەنی خانەنشینی، ئێستا لە هەندێك وڵات لەتەمەنی (٦٠) ساڵییەوە فەرمانبەر خانەنشین دەکەن. هەندێکی تر کردویانە بە (٦٥) ساڵ، هەندێکی تر کردویانە بە (٧٠) ساڵ. ئێستا لە هەندێك وڵاتی دنیا خەریکن دەیکەن بە (٧٠) ساڵی. سەعاتی کارکردن لە هەندێك وڵات سەعاتە، لە هەندێکی تر (٤٨)و لە هەندێکی تر (١٠٠) سەعاتە لەهەفتەیەکدا. باسی ئەوە دەکەیت

دەڵێی من ریفۆرم دەکەم مانای ئەوە نییە کە تۆ وەزعت خراپە، نیزامەکەی پێشو ئیتر لەگەڵ ژیاندا ناگونجێ ئەگەر بشگونجێ کەموکوڕی تێدا دەبێت. دەبێت شتێکی باشتر بدۆزیتەوە. شەخسی خۆم باوەڕم بەوە نییە بڵێین وەڵا ئێمە وەزعمان واخراپە ئایندە دەدۆڕێنین. ئایندە خەڵکی ئایندە بڕیاری لێدەدات، بەڵام لەم قۆناغەدا ئێمە پێویستمان بە هەندێك دەستكاری هەیە لەچەند شتێکی گرنگدا. پێویستمان بەدەستکاری هەیە لەپەیڕەوی ناوخۆی یەکێتیدا. پێویستمان بەدەستکاری کردنە لە بەرنامەی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوریو رۆشنبیری یەکێتیدا. پێویستمان بەدەستکاری کردن هەیە لە سەرکردایەتی یەکێتیدا.

*** کاک نەوشیروان لەئاستی کوردستاندا هەستدەکەی کە هێزی کۆمەڵایەتی تازە دەرکەوتوەو رەنگە تەعبیری خۆی لە حیزبی تردا بدۆزێتەوە؟**

- تائێستا نەخێر

*** لەقۆناغی داهاتوشدا پێتوایە هەر یەکێتیو پارتی گوزارشت لەویستی خەڵک دەکەن؟**

- بەڵێ، ئەو گروپە بچوکانەش لە هەندێك شاری کوردستاندا بە ناوی جیاجیاوە وەك رێکخراوی کۆمەڵی شارستانیو ئەوانە دروستدەبن بەشی زۆریان لەوانەن کە لایەنگر یان ئەندامی یەکێتین.

***ئیسلامی سیاسیی نابێتە رەوتێکی بەهێز کە ئەویش بەرنامەی چاکسازی لەبابەت ئەوانەی ئێوە بخاتەڕو و لەو بابەتانە قسە بکات کە یەکێتی قسەی لێدەکاتو جەماوەر لە یەکێتی بکاتەوە؟**

- ئەگەر یەکێتیو پارتی بەخۆیان نەکەون، هەندێك شتی واهەیە کە من بەدوری نازانم کە ئەوانیش بێنە کایەوەو ململانێ بکەن. حاڵی حازر لەکایەکەدان، لەپەرلەماندانو لەوەزارەتدانو رەنگە پرۆژەی خۆیان هەبێت بۆ کاروبارەکانیان، بەڵام زەمینەی ئەوەی کە ئیسلامی سیاسیی لەکوردستاندا کاروبار بگرێتە دەست بەباوەڕو هەڵسەنگاندنی من لەو قۆناغەو تاچەند ساڵێکی تریش شتی وا لە گۆڕێ نییە. پاش چەند ساڵیکی تریش بەراستی من نازانم.

*** لەسەر حکومەت، پێتوایە ئەو پێکهاتەی ئێستای حکومەت بتوانێ ئەرکەکانی خۆی رایی بکات؟ مەبەستم پارتیو یەکێتی نییە، مەبەست حکومەتە بەتێکڕایی.**

- بۆ ناتوانن؟ ماشەڵا ئەوەندە قەرەباڵغن هەق وایە زۆر بەچاکی کارەکانیان رایی بکەن.

*** هەر ئەو قەرەباڵغییە، بونی (٤٤) وەزیر، نابێتە لەمپەر؟**

- ئەو قەرەباڵغییەی دروست بوە کاتییەو بۆقۆناغی گواستنەوەیە. جاری یەکەم لەمەوپێش کە (١٦) وەزارەت هەبو ئەو (١٦) وەزارەتە لاساییکردنەوەی مەجلیسی تەنفیزیەکەی زەمانی حوکمەزاتییەکەی حیزبی بەعس بو. ئێستا لە بەغداد تەشکیلەی وەزارەتەکان گۆڕاوە. بۆ ئەوەی کە تۆ هاوشێوەبیت لەگەڵ تەشکیلەی وەزارەتەکانی بەغداد، پێویستە (٢٦) وەزارەت لە کوردستاندا دابمەزرێنی تا راستەوخۆ لە یەکتر بچیت. جگە لەوە حکومەتەکەی تۆ حکومەتێکی ئیئتیلافییە، یانی حکومەتی یەکێتی نیشتمانییەوهەمو حیزبەکانی تێدایە. لەم قۆناغەدا کورد پێویستی بە یەکرێزی هەیە. قۆناغێکی زۆر ناسکە لەمێژوی عیراقدا تێدەپەڕێت. قۆناغی داڕشتنەوەی دەوڵەتی عیراقە. قۆناغێکە کە کورد دەیەوێ لەم دەوڵەتە فاکتەرێکی سەرەکی بێت لەبڕیاردانی سیاسی ئێستاو پاشەڕۆژی عیراقدا. قۆناغێکە کە دەیەوێ سیستەمی فیدراڵی بچەسپێنێ لەکوردستاندا. ئەو یاسایانەی یارمەتی جێگیرکردنی سیستەمی فیدراڵی دەدات لەکوردستان لەپەرلەمانی عیراقییەوە دەردەچێ بەجۆرێك کە لەگەڵ بەرژەوەندی کورددا بگونجێت، ئەوە پێویستی بەوەهەیە کەکورد بەیەکگرتویی لەبەردەمی رو داوەکاندا بوەستێ ئەو یەکگرتوییە خۆی لەچیدا نواندوە؟ لەوەی کەبەشی هەرەزۆری حیزب و رێکخراوە سیاسییەکانی کە لەکوردستانی عیراقدا بونیان هەیە لەو حکومەتەدا بەشداریان هەبێت

*** ئۆپۆزسیۆن نییە، ئەی ژیانی دیموکراتی تەندروست بۆ کوێ بڕوا؟**

- بۆچی نییە، ئۆپۆزسیۆن ئێستا لەپەرلەمانەکەدا هەیە زۆر لەوانەی کەئەندامی یەکێتی و پارتی و حیزبەکانی ترن هەڵدەستن و قسەدەکەن، بەڵام هێشتا پەرلەمانەکەمان نەبوەتە شتێکی کارا. ئەوەی کە لەرۆژنامەکاندا دەیخوێنینەوە رەخنەگرتن لەحکومەت وداموودەزگاکانی و لەسەرۆکی هەرێم و لەسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و لەوەزیرەکان و لەئێمەو سەرکردایەتی حیزبەکان. ئەوە خۆی جۆرێکە لە ئۆپۆزسیۆن، ئەمانە هەموی بە نەزەری ئیعتبار وەردەگیرێن. تەماشادەکرێت کام رەخنەیە جدییە و کامەیان تەشهیر و کامەیان رەخنەیەکی راستەقینەیە؟ سەبارەت بەو یەکریزییە تۆ

لەم کاتەدا بۆنمونە پێویستت بەوە هەیە نوێنەری ئێزدی هەبێت لە حکومەتەکەدا، نوێنەری فەیلی هەبێت، نوێنەری تورکمان هەبێت، ئێوە خۆتان دەزانن ئەو دابڕانەی کە لەماوەی رابردودا رویداوە بۆتە هۆی ئەوەی کە بیرورای جیاجیا و تەنانەت جۆرێك لە بەرژەوەندی ناوچەیی دروست ببێت، بۆ نمونە سەبارەت بە تورکمانەکان دو تورکمان دیاریکراون لەسەر بنەمای ئەوەی یەکێکیان هی هەولێرە و یەکێکیان هی کەرکوکە، بۆ ئەوەی ببێتە پردی پەیوەندی لەنێوان تورکمانەکانی کەرکوك‌و حکومەتدا. لەناو ئێزدییەکاندا دو ئێزدی دانراون یەکێك لەوانەیە کە هی ئەو ناوچانەیە کە ماوەی رابردو لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بون، ئەوەی تریان هی ناوچەکانی دەرەوەی هەرێمە. مەسیحییەکان هەندێکیان خۆیان بەکلدو ئاسوری دەزانن، هەندێکیان خۆیان بەکلدان دەزانن‌و خۆیان بە ئاسوری نازانن، لەبەرئەوە لەسەر ئەو بنەمایە یەکێك تەرخانکراوە بۆ ئاشورییەکان، یەکێك بۆ کلدانییەکان. واتا ئەو قەرەباڵغییە بوە بەهۆی ئەوەی کە بەداخەوە تا ئێستا ئێمە لەقۆناغی گواستنەوەین‌و هێشتا وەکو ئەوەی پێی دەوترێت نەتەوەی دەوڵەت دروست نەبوە لەلای ئێمە. لەبەرئەوە ناچاری مەسەلەی فەیلی و ئێزدی بە نەزەری ئیعتیبار وەربگریت کە هەردوکیان کوردن، ناچاری مەسەلەی ناوچەگەریش بە نەزەری ئیعتیبار وەربگریت بادینانیە، سۆرانییە، سلێمانییە، هەولێرییە، کەرکوکییە، هەمو ئەوانە بە نەزەری ئیعتبار وەربگریت هەتا لەم قۆناغە دەپەڕینەوە، دەگەیتە شوێنێکی وەها کە ئیتر دڵنیای هیچ مەترسییەکی ئەوتۆت لەسەر نەماوە ئەوسا نە لەسەر بنەمای محاسەسەی نەتەوەیی‌و تایەفی، بەڵکو لەسەر بنەمای بەرنامەی سیاسی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکدا دەکەیت.

*** تاچەند پێت وایە ئەو وەزیرانەی یەکێتی دایناون دەتوانن ئەو ئەرکانە جێبەجێبکەن کە لەسەر شانیانە؟**

- ئومێدم وایە.

*** تۆ دەورت نەبوە لەدانانی کەسیان؟**

- من نەخێر.

*** ئێمە پێش روخانی سەدام حسێن باسمان لەوە دەکرد کە دیموکراسی لە کوردستانەوە دەچێت بۆ بەغدا، ئێستا وای لێهاتوە کە دیموکراسی لەبەغدا پێشکەوتوترە. خەریکە لەوێوە بەرەو کوردستان بێتەوە.**

- لەکوێی بەغدا؟

*** لەپەرلەمانی بەغدا.**

- لەپەرلەمانی بەغدا کە دێیتە دەرەوەو دەچیتە سەر جادە، چ جۆرە ئازادییەکی تێدایە؟ چەند کەس تا ئێستا لەسەر ئەوە کوژراون کە سەرتاشخانەیان هەبوە؟ چەند ژن کوژراون لەسەر ئەوەی کە ئارایشتگەیان هەبوە، چەند کەس کوژراوە لەسەر ئەوەی کە بیروڕای جیاوازی هەبوە لەزانکۆکاندا؟ چەند مامۆستاو چەند دکتۆرو چەند ئەندازیارو چەند کۆنە ئەندامی حیزبی بەعس کوژراوە تاکو ئێستا؟ چەند فرۆکەوان کوژراوەو چەند ئەفسەر کوژراوە؟ کە باسی ئەوە دەکەن هەقە بەویژدانەوە باسی بکەن، ئەو کەشەی کە ئێستا لە کوردستانی عیراقدا هەیە، بەسەدان رادیۆی (FM)و رادیۆی تر ئیشدەکەن، بەدەیان ئێزگەی تەلەفزیۆن ئیشدەکەن و بەئارەزوی خۆی قسە دەکات و جنێو بەهەمومان دەدات و جاری وا هەیە رەخنەکانیان تێپەڕبوە بۆ ئاستی جنێو. بەسەدان رۆژنامەی رۆژانەو هەفتانەو مانگانە دەردەچن و لەناوچەکەی ئێمەدا بڵاودەبنەوە، من نازانم ئێوە کە وەختێ بەراوردی ئێرە بەوێ دەکەن پێم سەیرە.

*** زیاتر مەبەستمان ئەنجومەنی نوێنەرانە کە نوێنەرایەتی دیموکراسی وڵات دەکات؟**

- ئەوە راستە لەمەوپێش پەرلەمانەکەی ئێمە بەهۆی دو ئیدارییەوە زۆر چالاك نەبو، ئومێدمان وایە لەمەولا چالاك و کارا بێت، من لێتان ناشارمەوە ئێمە وەکو کورد شانازی بەخۆمانەوە دەکەین و خۆمان زۆر هەڵدەکێشین، بەڵام کاتێك بەراوردی لێهاتویی دەکرێت لەناو رۆشنبیرو سیاسییەکانی کورد دا کاتێك بەراوردیان دەکەی بەعیراق لەعیراقدا زۆر زیاترن لە هی ئێمە.رەنگە یەکێك لەهۆکارەکەی ئەوە بێت کە پەرلەمانەکەی عیراق و وەزارەتەکەی عیراق لەچاو ئەوەی ئێمە چالاکترو کاراتر بێت.

*** بەڵام کاک نەوشیروان، لێرە هەمو دامودەزگاکانمان هەیە، پەرلەمانمان هەیە، حکومەتمان هەیە هەموشیان بەهەڵبژاردن و رێگا قانونییەکان دامەزراون، بەڵام هێشتا حیزب دەسەڵاتدارترە، ئایا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ شەرعییەتی مێژویی حیزب لە کوردستاندا، ئایا پێویست دەکات ئێوە وەکو یەکێتیی و پارتی بەئەندامەکانتان بڵێن، بڕۆن چی ئەڵێن، چی دەکەن لەحکومەتدا دەست واڵا بن؟**

- ئەزمونی کوردی ئەزمونێکی تایبەتە، بۆ نمونە لەبەریتانیا لیبراڵ و کۆنزێرڤاتیف کاتێك کە هەڵبژاردن دەکرێت ئیتر ئەوان دەبن

بەهێزی بنەڕەتی لەناو حکومەتدا. زۆرجار سەرکردەی حیزبەکەو نوێنەرەکانی کە هەڵبژێردراون بۆ پەرلەمان ئەوان دایاندەنێن، نەك حیزبەکە دایبنێت، لەوڵاتی ئێمەدا شتی واناکرێت، لەوڵاتی ئێمەدا تا ئێستا حیزب دەزگایەکی گرنگە بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت، یان حیزب لەپشت حکومەتەکەوەیە، رەنگە حکومەت بەتەنها نەتوانێت کارەکانی بکات، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەلومەرجەی کە لە کوردستاندا هەیە، کوردستان وەکو بەشێك لەعیراق، عیراق وەکو بەشێك لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەم ئەزمونەی ئێمە رەنگە نمونە بێت لەشوێنەکانی تری دنیادا، ئەمە ئەزمونی تایبەتی خۆمانە، لایەنە سەلبییەکانی چییەو لایەنە ئیجابییەکانی چییە؟ ئەوە دەکرێت باسی بکەین‌و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین، بەڵێ تەدەخولکردنی حیزب لەکاروباری حکومەتدا هەیە، بەڵام بەو ئەندازەیە نییە کە باسی دەکەن، رەنگە حیزب پارە لەحکومەت وەربگرێت بۆ کادرەکانی خۆی، خەڵکی بۆ ئەنێرێت تەعینی بکات، بەڵام ئێستا بڕۆن دەتوانن لەئەندامەکانی پەرلەمان کە وەختی خۆی یەکێتی تەرشیحی کردون بپرسن بزانن ئێمە چەندجار تەعلیماتمان داونەتێ تا بەقسەمان بکەن؟ لەوەتەی هەڵبژێردراون یەکجار کۆبونەوەمان پێکردون، ئیتر خۆیان ئازادبون لەوەی چی ئەکەن‌و چی ناکەن؟ وەزیرەکانیشمان بەهەمان شێوە بڕۆن دەتوانن لەوەزیرەکانمان بپرسن ئەوەی ئیدارەی پێشو و ئەوەی کە ئێستا دانراوە، چەند جار ئێمە شەرت‌و شروتی خۆمانمان بەسەرا فەرز کردون کە چی بکەن‌و چی نەکەن؟ راستە لەلایەن حیزبەکەی ئێمەوە تەرشیح کراون، بەڵام کە تەرشیحکراون لەبواری ئیشەکەی خۆیاندا ئازادییەکی زۆر زۆریان هەبوە، ئینجا کەوتۆتە سەرشانی ئەو کەسە خۆی کە ئایا چەند چالاکەو چەند چالاك نییە؟

*** ئایا کە چالاک نەبوە ناگەڕێتەوە بۆ کەموکوڕی حیزب لەدیاری کردنی ئەو کەسەدا؟**

- بەڵێ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە.

*** من دەگەڕێمەوە بۆ دەزگای لێپرسینەوە، وتتان یەکێک لەوانەی کە دەیانگرێتەوە ئەوانەن کە ئیشتیقاق لە حیزب دەکەن؟**

- ئەوەی ریزی یەکێتی تێکبدات، رەنگە من لەتەعبیرەکەمدا سەرکەوتو نەبوم بۆ نمونە تێکدان، تێکدانیش شتێکی خراپە، ئاژاوەنانەوەیە.

*** ئایا حیزب لە کوردستاندا کاریگەری خراپی نەبوە لەسەر**

**پەرەپێدانی سیاسی کۆمەڵگای کوردەواری؟**
- بەڕەئی من ئەگەر حیزب نەبوایە لە کوردستاندا شۆڕش نەدەبو، مقاوەمەت نەدەبو، راپەڕین نەدەبو.
*** مەبەستم دوای راپەڕینە؟**
- لەدوای راپەڕینیشەوە، حیزبەکان پاراستنی دەستکەوتەکانیان لەسەر مل بوە، یەعنی حیزبەکانن کە دەستکەوتەکانی میللەتەکەمانیان پاراستوە.
*** مەبەستم پەرەپێدانی سیاسی لەروە علمییەکەیەوە، وەکو ئەوەی کە جەنابت شارەزای بواری زانستی سیاسیت؟**
- پەرەپێدانی سیاسی تەنها بەحیزب ناکرێت، پەرەپێدانی سیاسی شتێکی هەمەلایەنەیە، لەقوتابی پۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە دەیگرێتەوە تا دەگاتە سەر تەدریبپێکردنی فەرمانبەرانی دەوڵەت، ئەمە پێویستی بەلێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆلۆجی، لێکۆڵینەوەی زانستی هەمەلایەنەو فرە دوڕایی هەیە بۆ ئەوەی تۆ بتوانی بیزانیت، هەمو شتەکان پێکەوە بەستراوە، یەعنی تۆ پەرەپێدانی سیاسی لەوڵاتێکدا کە ئێمە بەدرێژایی هەشتا ساڵ لەشەڕدا بوین لەگەڵ حکومەتدا، حکومەتت بەهی خۆت نەزانیوە، دامودەزگاکانت بەهی خۆت نەزانیوە، پردو رێگاو تاوەری کارەبات بەهی خۆت نەزانیوە، ماوەیەکی دورو درێژ خەڵکت راهێناوە لەسەر ئەوەی ئەمانە چۆن تێکبدەن، پاش ئەوەی حکومەت دەگریتە دەست دەبێت بەپارێزەری ئەمانە. لەتێکدەرەوە دەبیت بەبنیاتنەر، ئەو پرۆسەیە واتا گۆڕانی ئەوەی لەشەڕکەرەوە خەڵك بکەیت بەبنیاتنەر، بیکەی بەوەی کە عەرەب پێی دەڵێت (رجل الدولە): پرۆسەیەکی زۆر زۆر ئاڵۆزە. من پێموایە ئێمە لە کوردستان ئەوەمان تێپەڕاندوە. ئەوە یەکێکە لەوەی کە پێی دەڵێن پەرەپێدانی سیاسی، چۆن تۆ دەتوانی پێشمەرگەیەك لەوەوپێش هاتوە پردی روخانوە، ئێستا دەچێتەوە بۆ ناوچەکەی خۆی سەیری ناوچەکەی خۆی دەکات، تەماشا دەکات لەسێ جێگەی تر پێویستی بەوەیە پرد بکرێت ئەیکات بەشەڕ لەگەڵ وەزیری ئاوەدانکردنەوەدا، ئەڵێ: ناوچەکەمان پێویستی بەسێ پرد هەیە بۆ دروستت نەکردوە؟ لەوانەیە وەختی خۆی پردەکەی روخاندبێت! چەند جار کە حکومەتی عیراق تاوەری کارەبای دروستکردوە خەڵکمان ناردوە، چوە خراپی کردوە، ئێستا خەڵکی ناوچەکان شەڕ لەسەر ئەوە دەکەن بۆ کارەبامان نییە؟ ئەوە بەشێکە لەپەرەپێدانی سیاسی. رەنگە وەکو موحازەرەو وەکو

وەعزی مەلا لەمزگەوتێکدا دانەنیشتبین‌و کۆ نەبوبێتینەوە بڵێین دەبێت وا بکەیت‌و ئەمە بکەیت‌و ئەوە بکەیت، ئەوە خۆی لەخۆیدا بەشێکە لەپەرەپێدانی سیاسی.

*** خۆتان یەکێک بون لەوانەی بەشداریتان کرد لەداڕشتنی دەستوری عیراق بەتایبەتی ئەو مەلەفاتانەی کە پەیوەندی بەمافی کوردو فیدراڵی‌و...هەبو، ئایا پێتانوایە ئەوەی لەدەستوردا هاتوە تێری پێداویستییەکانی خەڵکی کوردستان دەکات؟ هەم لەباری قەومی‌و هەم لەباری تاکی کوردییەوە؟**

-تۆ دەبێت باسی ئەوە بکەیت لەبەینی ئەوەی کە ئاواتی کوردەو لەبەینی ئەوەی کە قابیلی جێبەجێکردنە، ئەگینا ئەوەی کە تێری کورد دەکات دەبێت دەوڵەتی خۆی هەبێت، وەکو هەمو میللەتانی دنیا، ناسنامەی تایبەتی خۆی هەبێت، بەڵام ئەوەی لەم قۆناغەدا مومکینەو لەتواندابوە،پێموایە لەوە زیاتر مومکین نەبوە.

***باشە ئەگەر ئەم مافانە مومارەسە بکرێت بێگومان کۆمەڵگای کوردستانی گەشەپێدەدات، میللەتی کورد پێشدەخات، ئایا کورد ناگاتە ئەو قۆناغەی داوای سەربەخۆیی بکات یان بەرەو ئیندماج لەگەڵ عیراق دەڕوات؟**

-ئەوە بەستراوە بەو رودوانەی کە لەعیراق و ناوچەکە رودەدات، چونکە وەکو باسم کرد هیواو ئاوات شتێکە، راستی روداوەکانی سەر ئەرز شتێکی ترە. بەپێچەوانەی هەندێك بۆچونی هەندێك لەو رۆشنبیرو نوسەرانەی کە ئێستا باسی ئەوە دەکەن هەلی مێژویی هەڵکەوتوە بۆ کورد دەوڵەتی خۆی دروست بکات‌و کورد جیا ببێتەوە، من پێموایە ئێستا هەلومەرجی دروستکردنی دەوڵەتی کوردستان لەعیراقدا کامڵ نەبوە.

***پانزە ساڵە کورد ئەزمونێکی سیاسیی هەیەو حوکمڕانی خۆی دەکات، پێت وایە بزوتنەوەی سیاسی کوردستان توانیویەتی مەناعە پەیدا بکات بەرامبەر ئەوەی لەچوارچێوەی عیراقدا حیزبی سیاسی عیراقی تر نەبنە حیزبی سەرتاسەری؟**

-پێموایە وابێت؟

***یەعنی پێشبینی ئەوە ناکەی ئەندامی چالاکی کورد هەبێت لەناو حیزبە عیراقییەکاندا؟**

- من لەئاسۆی نزیکدا نابینم کە خەڵك لەدەوری پرۆگرامی سیاسی کۆببێتەوە لەعیراقدا. لەسەر ناسنامەی تائیفی‌و نەتەوەیی کۆ دەبێتەوە، یەعنی کورد لەگەڵ کورد، شیعە لەگەڵ شیعە سوننە

لەگەڵ سوننە و تورکمان لەگەڵ تورکمانو مەسیحیش لەگەڵ مەسیحی دەبێت. ماوەیەکی دەوێت هەتاکو وای لێبێت لەبەینی ئەمانە جۆرێك لەمتمانە بەیەککردن دروست بێت، ماوەیەکی وابێتە پێشەوە کە پرۆگرامی سیاسی ببێت بەوەی کە خەڵکی لەدەوری کۆببنەوە، نەك ناسنامەی نەتەوەیی یان مەزهەبی بێت بەهۆی دەنگدان، من پێم وایە لەئاسۆی نزیکدا ئەوە نابینم. هەتا ئەگەر تێبینی بکەن ئەو دابەشبونە نەتەوەییو مەزهەبییەش لەگەڵ خۆیدا پرۆگرامێکی سیاسی هێناوە، یەعنی سوننە لەخۆرئاوای عیراق جۆرێك لەپرۆگرامی سیاسییان هەیە بۆ داهاتوی عیراق، شیعە جۆرێك لەپرۆگرامی سیاسیان هەیە بۆ داهاتوی عیراق، کوردیش جۆرێك لەپرۆگرامی سیاسی هەیە،

***هەرکەسە لەڕوانگەی خۆیەوە؟**

- بەڵێ

***پێشبینی دەکەیت ماددەی (١٤٠) جێبەجێبکرێت، حکومەتی عیراق جێبەجێی بکات، یەعنی ئەو ماددەیە ئەگەر جێبەجێ بێت کەرکوک دەگێڕێتەوە بۆ کوردستان؟**

- خۆی بەداخەوە مەسەلەی کەرکوك وەکو مەسەلەیەکی کوردی روت یان مەسەلەیەکی عیراق نەماوەتەوە، کەرکوك بوە بە مەسەلەیەك چەند دوراییەکی ئیقلیمیو دەولیشی بۆ دروست بوە، من پێموایە ئەگەر کورد یەکگرتوبێت، سوربێت، پلانێکی هەمە لایەنە دابنێت بۆ بردنەوەی ئەوەی کە پێی دەڵێن دڵو عەقڵی کەرکوکییەکان.ئەوا سەرکەوتو دەبین لە کەرکوك.

***دەزگای لێپرسینەوە چ رەپتێکی یاسایی دەبێت بەدادگاکانەوە؟ هیچ میکانیزمێک هەیە بۆ ئەوەی فایلێک لە دیوانی لێپرسینەوە بچێتە بۆ دادگاکان؟**

- هیچ میکانیزمێکی دیار نییە، خۆی لەیەکێك لەخاڵەکاندا هاتوە ئەگەر پێویستی کرد کە فایلەکەی کەڵەکەبو لەسەری وتوانیت ئەو تۆمەتانەی لەسەریەتی بە بەڵگەوە بیسەلمێنی، دیوانی لێپرسینەوە ئەو لایەنە نییە بتوانێ خۆی خەڵك دادگایی بکاتو بیخاتە زیندانەوە یان غەرامەی لێ بستێنێ، بەڵکو یارمەتی دادگای حکومەت دەداتو دۆسیەکەی دەنێرێت بۆ ئەوێو دەیخاتە بەر لێکۆڵینەوەی دادگای حکومەتی، ئەوە لە دنیای پێشکەوتودا هەیە، ئێوە وەکو رۆژنامەنوس بۆ نمونە لە وڵاتانی پێشکەوتوی دنیادا جاری واهەیە هەندێك لێکۆڵینەوە

ڕۆژنامە دەیکات. واتەواتێك بڵاودەبێتەوە لەسەر بەرپرسێك کە فەزیحەیەکی لێقەوماوە، پۆلیس ناتوانێ بڕوات بۆ هەندێ جێگاو بچێتە وردەکاری مەسەلەکەوە، جاری واهەیە ئەو فەزیحانە پەیوەندیان بە شوێنی قومارخانە، یان شوێنی تلیاك یان شوێنی لەشفرۆشیی‌و شتی لەو بابەتانەوە هەیە کە پۆلیس ناتوانێ بچێتە ئەو شوێنانە، ڕۆژنامەنوسێکی بەتوانا یان بەشی لێکۆڵینەوە لەیەکێك لەرۆژنامەکاندا ئەو ئەرکە دەگرێتە سەرشانی خۆی و هەماهەنگی دەکات لەگەڵ پۆلیسدا. دەڵێ ئێمە دەچین خەریکی لێکۆڵینەوە دەبین لەو مەسەلەیە ئێوە ئاگاتان لێمان بێت، ئەوە پێی دەڵێن لەژێر پەردەی یاساییدا. لەژێر پەردەی پۆلیسدا دەڕوا ئەو شتانە دەکات، بەڵام لەسنوری یاسا دەرناچێتە دەرەوە هەتا دەگاتە ئەنجامەکەی. کاتێك فەزیحەکەی ئاشکراکرد وەك سەبقی ڕۆژنامەوانیی لە ڕۆژنامەکەیدا بڵاوی دەکاتەوەولەهەمان کاتدا فایلەکەشی تەسلیم بە پۆلیس دەکات، دەڵێ ئەوەم بۆ گەڵاڵە کردوی ئیتر پۆلیس دوای دەکەوێت‌و دەڕوات خەریکی دەبێت، ئەوەی ئێمە ڕەنگە شتێکی لەو بابەتە بێت.

## ٢٤- ١- ٢٠٠٧ (ژماره ٣١٠)

# هاوڵاتی

**نەوشیروان مستەفا:**
**لە ڕەخنە گرتنماندا کەس ناخەینە ناو هێڵی سورەوە**

سازدانی: هاوڵاتی
نەوشیروان مستەفا دەربارەی ئیعفاکردنی تاڵەبانی و بارزانی لە ڕەخنەگرتن دوای خەملێنی هەیکەلی کۆمپانیای وشە، کە نەوشیروان مستەفا سەرپەرشتی دەکات، بڕیارە چەند مانگێکی تر بە کۆمەڵێك چالاکیی ئیعلامیی و لێکۆڵینەوە دەستپێدەکات. هاوڵاتی بە پێویستی زانی وردەکاری پڕۆژەکە لە زاری نەوشیروان خۆیەوە بزانێت و ئەم گفتوگۆیەی ئەنجامدا.

**هاوڵاتی: ئەم پڕۆژەیە چۆن هاتەبون، ئایا پێشتر بیرت لێکردبوەوە؟**
نەوشیروان: من پێش پێنج ساڵ لەمەوبەر بیرێکی وام لا گەڵاڵە ببو، لەگەڵ هەندێك لە ئەندامانی سەرکردایەتی و بە تایبەت مام جەلال باسم کردبو، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو کاتە جێبەجێنەدەکرا، وازم لێدەهێنا، لە ڕاستیدا ئەو پڕۆژەیە من لە بیرمایەو لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوڕێ و هاوکارەکانمدا جێبەجێی دەکەین، بریتییە لە پڕکردنەوەی دو بۆشایی کە ئێمە پێمانوایە لە کوردستانی عێراقدا هەیە، بۆشاییەکیان لە ڕاگەیاندندایە ئەویش

ئەوەیە لە کوردستاندا راگەیاندنەکان بە گشتیی حیزبیی و حکومین، واتە پاوانکراون لەلایەن حیزبەکانەوە، لەلایەن یەکێتی نیشتمانی، پارتی دیموکرات، حیزبی شیوعی عێراق، بزوتنەوەی ئیسلامیی، زەحمەتکێشان، کۆمەڵی ئیسلامی، سۆسیالیست، واتە هەر دەزگایەکی راگەیاندن دەگریت سەر بە حیزبێکی دیاریکراوە و ئیش بۆ ئەو حیزبە دەکات، لەبەرئەوەی ئێمە پێمانوایە کە بۆشاییەك لە راگەیاندندا هەیە، کە ئەویش بۆشایی راگەیاندنی ئازادە، راگەیاندنێك کە لە روی سیاسییەوە سەربەخۆ بێت، سەر بە هیچ حیزبێك نەبێت، سەر بە حکومەت نەبێت، بۆ ئەوەی سەربەخۆیی سیاسیی خۆی بپارێزێت سەربەخۆ بێت و بتوانێت لەسەر قاچی خۆی رابوەستێت، ئەمە یەکێکە لەو بۆشاییانەی کە ئێمە هەوڵدەدەین لە قۆناغی داهاتودا پڕی بکەینەوە.

**هاوڵاتی: تۆ باسی راگەیاندنی ئازاد دەکەیت، لە کاتێکدا دو مەرجی بنەڕەتیی هەمو راگەیاندنی ئازاد بریتییە لە میزانیەیەکی سەربەخۆ، واتە پڕۆژەکە لەلایەن هێزێکی سیاسی دیاریکراوەوە تەمویل نەکرێت، لە هەمانکاتدا ئەو خەڵکانەی تێیدا ئیش دەکەن خەڵکانێکی سەربەخۆ بن و روئیا و بۆچونی تایبەت بە خۆیان هەبێت، بەڵام پڕۆژەکەی ئێوە میزانییەکەی لەلایەن یەکێتییەوە دابینکراوە، لە هەمانکاتدا بەشێکی زۆری کادرەکانی لە ناو یەکێتیدا بون پێشتر، چۆن لە نێو ئەم دو شتەدا راگەیاندنی ئازاد بدۆزینەوە؟**

نەوشیروان: لە روی هێزی مرۆییەوە، ئەوانەی کە لەناو ئەم دەزگایەدا کاردەکەن، گوێنادەینە بیروباوەڕی سیاسیان، هەر کەسێك لەم دەزگایەدا کاربکات ئەتوانێ بیروباوەری سیاسی تایبەت بەخۆی هەبێت، ئێمە بە لامانەوە گرنگ نییە بیروباوەڕی پارتی هەبێت، یەکێتی بێت، کۆمۆنیست بێت، ئیسلامی بێت، دو شت لای ئێمە گرنگە لە هەمو ئەو کەسانەی کە لە پڕۆژەکەدا کاردەکەن، ئەوەیە لە روی پیشەییەوە پرۆفیشناڵ بێت و بتوانێت کارەکەی بە رێکوپێکی ئەنجامبدات، لە روی ناوبانگیشەوە ناوبانگی باش بێت، ئێمە رێزی بیروباوەڕی سیاسی ئەگرین، هەوڵدەدەین باشترین توناکانی کە ئەتوانن ئیشبکەن، لە ناو هەر حیزبێکی سیاسیدا کاربکەن ئێمە کۆیان دەکەینەوەو هەوڵدەدەین بیانخەینە گەڕ.

لە روی داراییشەوە لە راستیدا، نە لە لایەن یەکێتییەوە، نە لەلایەن حکومەتەوە دارایی ئێمە دابین ناکرێت، هەوڵماندا وە

پێشەکی ژێرخانی پرۆژەکەمان دابینبکەین، سەرمایەیەکی بۆ ئامادە بکەین، باوەڕم وایە دو تا سێ ساڵ ئێمە ئەتوانین بە بێ هیچ یارمەتییەك لە حکومەت، درێژە بە پرۆژەکە بدەین، ئەو میزانییەی ئێمە ئامادەمانکردوە، نە لە لایەن یەکێتییەوە نە لە لایەن حکومەتەوە جێبەجێنەکراوە.

**هاوڵاتی: ئەکرێت بڵێن یارمەتی هەندێک شەخسیات و خەڵکی بێلایەنە کۆکراوەتەوە؟**

نەوشیروان: بێلایەن تا ئێستا بەشدارینەکردوە، بەڵام کۆمەڵێك لە سەرمایەدارەکانی کورد بەڵێنیانداوە بە قورسایی بەشدارییبکەن لەسەرخستنی پرۆژەکەدا.

**هاوڵاتی هیچ مەرجێکیان نییە؟**

نەوشیروان: مەرجیان ئەوەیە ئازادو سەربەخۆ بن، ئەمەوێت تێبینییەك بڵێم لەسەر کاری سیاسی، هەمو کارێکی سیاسی بە مانای حیزبایەتیکردن نایەت، هەمو کارێکی حیزبایەتی ڕەنگە کارێکی سیاسی بێت، بەڵام هەمو کارێکی سیاسی حیزبی نییە، ئەم کارەی ئێمە لەوانەیە ڕەنگی سیاسی هەبێت، بەڵام مانای ئەوە نییە کارێکی حیزبییە، ئێمە پرۆژەیەکی سەربەخۆین.

**هاوڵاتی: پەیوەندی ئەم پرۆژەیە لەگەڵ یەکێتیدا، هەم وەکو حیزب هەم وەکو کەسایەتییەکانی ناوی چۆنە؟**

نەوشیروان: ئێمە هەوڵدەدەین پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ یەکێتی، لەگەڵ مام جەلال، کاك مەسعود، لەگەڵ پارتی و لەگەڵ هەمو حیزبە کوردستانییەکاندا پەیوەندی زۆر ئاسایی بن، پرۆژەکەی ئێمە لە ڕاستیدا نەك دژی هیچ حیزب و کەسێك نییە، بەڵکو بۆ یارمەتیدانیانە، بۆ یارمەتیدانی سەرکردایەتی سیاسی کورد و حکومەتی هەرێم و بۆ یارمەتی حیزبەکانە، بۆ بەرچاو ڕۆشنکردنی ئەوانە.

**هاوڵاتی: بەڵام هەستناکەن دەزگاکەتان جۆرێک لە ڕوبەڕوبونەوەی لەگەڵ دەسەڵاتدا بۆ دروستدەبێت؟**

نەوشیروان: ڕەنگە ڕوبەڕوبونەوە دروستبێت، بەڵام ڕوبەڕوبونەوەیەکی دوژمنانە نابێت، پەندێکی کۆنی کوردی هەیە،

ئەڵێ: «دۆست ئەوەیە ئەمگریەنێ، دوژمن ئەوەیە ئەم کەنێنێ»، ئێمە رەخنەکانمان هیچ جارێك لە سەنگەری دوژمنایەتییەوە نابن، لە سەنگەری دۆستایەتییەوە بۆ چاککردنی کێشەکان رەخنەکانمان دەگرین.

**هاوڵاتی: بۆ نمونە کە روبەڕوی دیاردەیەکی وەک گەندەڵیی دەبنەوە، چۆن دەتوانن روبەڕوی ببنەوە؟**

نەوشیروان: هەوڵدەدەین راستیی بە خەڵك بگەیەنین، رەنگە دوچاری روبەڕوبونەوە ببین، توشی کۆسپ بین، بەڵام بەشێك لە ژیان و بنچینەی رۆژنامەوانیی کە باسی ئەوە دەکەن دەسەڵاتی چوارەمە، لە هەمو کۆمەڵە نوێیەکانی دنیادا رۆژنامەوان دەتوانێت دەوری خۆی ببینێت لە ئاشکراکردنی گەندەڵیی، دروستکردنی رۆشنایی، لە بڵاوکردنەوەی فەرهەنگی دیموکراسی، فەرهەنگی قبوڵکردنی راو رای پێچەوانە.

**هاوڵاتی: ئەگەر وردتر قسە بکەین لەسەر کاری دەزگا ئیعلامییەکەتان بە تایبەت تەلەفزیۆن رۆژنامەکە، ئامادەن دەستبخەنە سەر ئەو کەسە گەندەڵ و بەرپرسە گەندەڵانەی کە تا ئێستا کەناڵەکانی تر ناویان ناهێنن و بە گشتی باسیان دەکەن؟ ئایا ئەتوانن بە وردتر ئەو کارە بکەن، بە پشت بەستن بەو ئیرادە سیاسی و دەسەڵاتەی هەتانە؟**

نەوشیروان: ئێمە لە دو رووەوە لەو گیروگرفتانە دەڕوانین، یەکەمیان وەرگرتنی مەسەلەیەکە وەکو دیاردە، بۆچی ئەو دیاردەیە دروست بوە، بۆچی گەشەیکردوە، بۆچی لە هەندێك شوێندا زاڵ بوە لە ناو دیاردەکەشدا رەنگە کەسانێك هەبن، بەشی شێریان بەردەکەوێت لە دروستکردنی کێشەکان، ئەوەی ئێمە بەڵگەی قانونیمان بە دەستەوەبێت و توشی سزای قانونیی نەبین بەڵێ دەیکەین.

**هاوڵاتی: ئێوە بانکێکی زانیاریی باشتان لەبەردەستدایە بۆ گەیشتن بە هەواڵ و داتاو ژمارەکان، بە حوکمی ئەوەی کە خەڵکانێکی زۆر لایەنگری تەوژمەکەی ئێوەن لە یەکێتی و حکومەتدا، وەکو لێپرسراوە حیزبیی و حکومییەکان، ئایا تۆ پەیوەندییەکانی خۆت بەکاردەهێنیت بۆ دەستکەوتنی زانیاریی؟**

نەوشیروان: بەڵێ بەکاریدەهێنم، ئومێدەواریشم ئەوانە

هاوکاریمان بکەن.

**هاوڵاتی: پێشبینی ناکەی ئەوە جۆرێک پەرچەکردار دروست بکات لەلای یەکێتی، بۆ ئەو کەسانەی کە یارمەتی تۆ دەدەن؟**
نەوشیروان: رەنگە کێشە دروستبکات، بەڵام گرنگ نییە، چونکە هەم سەرکردایەتیی حیزبەکان و هەم حکومەتیش بە رەسمیی باسی گەندەڵیی دەکەن، باسی چاکسازیی و پاکسازیی دەکەن، ئەوەی ئێمەش لەو سنورە دەرناچێت.

**هاوڵاتی: ئەوانەی لە دەرەوەی پرۆژەکەن و هاوکاری ئێوە دەکەن، بۆ نمونە ئێمە چەندین کەس لەسەر ئەوەی هەواڵی بە هاوڵاتی داوە فەسڵکراوە یان نەقلکراوە، ئێوە بیرتان لەوە کردوەتەوە کە پشتیوانی ئەو کەسانە بکەن کە لەسەر ئێوە سزا دەدرێن؟**
نەوشیروان: بەڵێ بیرمان لەوە کردوەتەوە رێز لە سەرچاوەکانی خۆمان بگرین، لە پاشەڕۆژێکیشدا ئەگەر کەسێك لەسەر ئەوەی زانیارییەکی بە ئێمە دابێت و زیانی پێگەیشتبێت، ئێمە ئامادەین قەرەبوی بۆ بکەینەوە.

**هاوڵاتی: ئێستا پێگەی ئێوە لە ناو یەکێتییدا چییە؟**
نەوشیروان: ئێستا هیچ پۆستێکم لە ناو یەکێتییدا نییە، تەنها بۆ گەل و نیشتمان کاردەکەم و هیچ پابەندییەکم بەرامبەر بە یەکێتی نییە، غەیری پابەندیی نیشتمانیی و نەتەوەیی.

**هاوڵاتی: بە تەمای لە کاتێکی تردا بگەڕێیتەوە بۆ ناو یەکێتی؟**
نەوشیروان: لە راستیدا من جارێکی تر بەتەمانیم لە کاروباری حیزبیدا هیچ پۆستێکی گرنگ بگرمە دەست، بەڵام روداوەکانی کوردستان جاری وا هەیە کە لێقەومانێك دێتە پێشەوە ئینسان ناتوانێت بێلایەن بێت لەسەر چارەنوسی نەتەوەکەی، ئەگینا وەکو تر من خۆم بە تەمای هیچ نیم.

**هاوڵاتی: ئەگەر لە بارودۆخێکدا یەکێتی لەگەڵ لایەنێکی سیاسی توشی کێشە هات، پرۆژەکەی ئێوە ناچێتە خزمەتی یەکێتییەوە؟**
نەوشیروان: لە حاڵەتی وادا ئێمە بێلایەنی خۆمان رادەگرین، ناهێڵین بەهیچ لایەکدا بشکێتەوە.

**هاوڵاتی: ئەم کشانەوەیەت لە ژیانی حیزبیی، چی جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ ئەوەی ساڵی ١٩٩٤ دا، ئایا روداوی وەک ئەوەی ساڵی ١٩٩٥ جارێکی تر ئەتهێنێتەوە بۆ ناو ژیانی حیزبیی؟**

نەوشیروان: من ئەو جارانەی دورکەوتومەتەوە لە ژیانی حیزبیی لە هەندێك لە کۆبونەوەکانی ناو کوردستاندا دورکەوتبومەوە، ئەگینا لە کاتی روخانی سەددامدا منی تیابوم، لە نوسینی دەستوردا منی تیابوم، گفتوگۆکانی نێوان یەکێتی و پارتی لە کاتی شەڕدا، جارێك لە تاران بوم، جارێك لە ئێرلەندا بوم، جارێك لە پاریس منی تیابوم، رەنگە لە کۆبونەوەی شانەو کۆمیتەو شتی وا دورکەوتبومەوە، ئەگینا لە روداوە سیاسییە گەورەکاندا بەشداربوم، دورکەوتنەوەی من لەو زەمانەدا لەبەرئەوە بوە لە ناو یەکێتیدا ئێمە شەڕی ناوخۆمان هەبو، من کەسێکم لە زۆر لاوە بەوە تاوانبارم دەکەن کە دەستم هەبوە لە هەڵگیرساندنی شەڕی براکوژیدا، شەڕم کردوە لەگەڵ لایەنی جیاجیادا، قەت حەزم نەکردوە لە ناو یەکێتیدا شتێك هەڵبگیرسێت سەبەبەکەی بگەڕێننەوە بۆ من، بڵێن ئەوە شەڕی کەس نەما شەڕی یەکێتیشی کرد، ئەمجارەیان بۆیە چومەدەرەوە.

**هاوڵاتی: ئەو پرۆژەیەی تۆ نابێتە هۆی لاوازکردنی یەکێتی؟**

نەوشیروان: رەنگە هەندێك هەبن لەناو یەکێتیدا پێیانوابێت کە بە وازهێنانی من دەردەسەرێکیان لە کۆڵبۆتەوە کە یەکێتی بەهێز دەکات، من هەمیشە حیزب لەلام وەسیلە بوە بۆ بیروڕاو تێکۆشان، حیزب ئامانج نییە، من پێش یەکێتی لە حیزبی تردا بوم، پێم وابوە یەکێتی وەسیلەیەك بوە بۆ خزمەتکردنی میللەتەکەم، بۆ خزمەتکردنی ئەو ئامانجەی کە خۆم باوەڕم پێیەتی، کە وەختێك بزانم دەقاودەقی ئەوە جێبەجێناکات رێگەیەکی تر دەگرمە بەر، وەکو ئەوەی ئێستا گرتومەتەبەر.

**هاوڵاتی: ئێستا قەناعەتت بەوە نییە کە یەکێتی بتوانێت ئەو ئامانجە بەدەستبهێنێت؟**

نەوشیروان: ئەوەی من دەمەوێت نەخێر

**هاوڵاتی: قسەیەکی خەڵکی هەیە دەڵێن، کە تۆ لەناو چەند دانیشتنێکی**

**سیاسی و کۆمەڵایەتیدا تۆ وتوتە لەم پڕۆژە ئیعلامییەدا، یەکێتی هێڵی سورە، بەڵێنت بە مام جەلال داوە کە مەسی موقەدەساتی ئەو و هەندێک خەڵکی نزیک ئەو نەکەی، ئایا ئەمە راستە؟**

نەوشیروان: ئێمە یەکێك لە سەرەتاکانی ئیشکردنمان لەسەرتاسەری پڕۆژەکەدا ئەوەیە کە ڕێگەی تەشهیرو جنێودان ناگرینەبەر کە هەندێك کەس دەیکەن، بە ناوزڕاندنی خەڵك، ئێمە ئەوە ناکەین، بێجگە لە پابەندی سیاسی و مەسەلەکانی کوردو ئەوانەی دەکەوێتە خانەی ئاسایشی نەتەوەییە، هیچ پابەندییەکی ترمان نییە.

**هاولاتی: ئایا مام جەلال و کاک مەسعود دەکەونە ناوچەی هێڵی سورەوە لە رەخنەگرتنی پڕۆژەکەی ئێوە؟**

نەوشیروان: نەخێر لە رەخنەگرتندا کەس ناچێتە ناو هێڵی سورەوە، بەڵام مانای هێرشکردنە سەر نییە.

**هاولاتی: ئەو قەناعەتەی کە هەتە لە ژیانی رۆژانەتدا، دەچێتە ناو پڕۆژەکەتەوە؟**

نەوشیروان: ئەو پڕۆژەیە بە تەنیا هی من نییە، بە تایبەتی لێرە بەدواوە بە تەنیا هی من نابێت، ئەو پڕۆژەیە ئێمە وادەکەین دەستەیەکی سەرپەرشتیکردنی هەبێت، ئەو دەستەیە لە چوارچێوەی گشتی ستراتیژی ئیشەکەدا دائەنرێت، لە ناو پڕۆژەیەدا ئێمە هەوڵدەدەین بۆ راگەیاندنێکی ئازاد، بیرکردنەوەیەکی ئازاد دابمەزرێنین، لەبەر ئەوە لەناو خۆماندا بە تەبیعەتی حاڵ زۆرتر ئازادیی هەیە، من بە تەمانییم بیروبۆچونەکانی خۆم بسەپێنم بەسەر کەسێکدا.

**هاولاتی: قسەیەک هەیە کە ئەم پڕۆژەیەی تۆ درێژکردنەوەیەکە بۆ تەمەنی سیاسی یەکێتی لەم وەزعەی ئێستادا، ئایا ئەمە تا چەند راستە؟**

نەوشیروان: من حاڵی حازر هیچ ئیتتیفاقێکم لە گەڵ یەکێتیدا نییە، ئەم پڕۆژەیە دو کۆڵەکەی هەیە، کۆڵەکەکیان راگەیاندنە، کۆڵەکەیەکیان بیرکردنەوەیە، ئەوە ئێمە نابەستێتەوە بە هیچ لایەکەوە، غەیری هاولاتی بون و قازانجی موشتەرەکی نەتەوەکەمان.

مەسەلەی درێژەدان بەتەمەنی حیزب، ئەوە رەنگە بە کۆمەڵێك هەلومەرجی سیاسیی و کۆمەڵایەتی و ئابوری بکرێت، کە نەبەستراوە بە ئیرادەی یەك کەس و دو کەسەوە، ئەگەر تا ئێوارە من بمەوێت درێژە بە ژیانی یەکێتی بدەم، بەڵام ئەگەر خۆی هۆیەکانی ژیانی تێدا نەمابێت، ناتوانم من درێژە بە ژیانی بدەم، بەڵام ئەگەر خۆی هۆیەکانی ژیانی تێدابێت، من دوژمنایەتیشی بکەم ناتوانم لە تەمەنی ئەو کورتبکەمەوە.

**هاوڵاتی: بەڵام خەڵکێکی زۆر هیوای بەتۆدا هەڵواسی، ئایا تۆ لە ئاستی هیوای ئەو خەڵکەدا دەبیت بۆ گۆڕانکارییەکان؟**

نەوشیروان: من لەگەڵ هەمو کارەسات و ناخۆشییەکانی نەتەوەکەما بوم، باوەڕناکەم لە سەرتاسەری کوردستاندا کەس رازیبێت لە سەر وەزعەکە، بەڵام قەت پشتیوانیی لە خۆپیشاندانێك ناکەم کە بچێتە سەر مەکتەبێك بیسوتێنێ، بەردبارانی دەزگایەکی حکومەت بکات، یان تاکسیەك بسوتێنێ، پێموایە ئەمە فەرهەنگێکی چەوتە بڵاوبوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە خەڵك گوشار دروستبکات بەرێگای جیا جیا، بەرێگەی خۆپیشاندان، بەرێگای مانگرتن، بەرێگای گروپی فشار، بۆ ئەوەی هەندێك گۆڕین لە سیستەمی پەروەردە، لە سیستمی خوێندن، لە سیستەمی کشتوکاڵ، لە کارەبادا، من بە مەسەلەیەکی رەوای دەزانم و لە گەڵیشیاندا دەبم.

**هاوڵاتی: لە هەڵبژاردنەکاندا ئەگەر کوتلەکەی تۆ سەرکەوتنی بە دەستبهێنایە ئەم پرۆژەیەی ئێستات دەکرد؟**

نەوشیروان: پێموایە بە جۆرێك لە جۆرەکان هەر دەمکرد، بەڵام رەنگە ئەوکاتە خۆم نەمکردایە، خەڵکی ترمان راسپاردایە بیکردایە.

**هاوڵاتی: بە حوکمی ئەوەی زیاتر دەستت دەگات بە ناوچەکانی سلێمانی و دەوروبەری، کەمتر دەستت دەگات بە ناوچەکانی پارتی، ئایا پیلانێک هەیە کە بتوانی هەمان ئەو روماڵکردنە رۆژنامەوانییەی کە لەم ناوچەیەدا دەکەیت لە ناوچەکانی هەولێریشدا ئەنجامی بدەیت؟**

نەوشیروان: من ئومێدم وایە پارتی و سەرکردەکانی پارتیش ئەوپەڕی هاریکاریمان بکەن بۆ ئەوەی ئەو کارانە ئەنجام بدەین.

**هاوڵاتی: هیچ هەنگاوێک نراوە بۆ ئەو کارە؟**
نەوشیروان: تائێستا هیچ هەنگاوێکی رەسمیمان نەناوە بۆ قسەکردن لەگەڵ لێپرسراوێکی پارتیدا، چونکە جارێ لە قۆناغی خۆ ئامادەکردندایین.

**هاوڵاتی: دەنگۆی ئەوە هەیە کە ئەم دەزگایە زیاتر کەسە ناڕەزاییەکانی ناو یەکێتی بگرێتەوە، ئەمە چۆنە، بە تایبەت بۆ لێدانی ئەو کەسانەی کە لەناو یەکێتیدا رازین؟**
نەوشیروان: رەنگە من بخەیتە خانەی ناڕازییەوە، بەڵام من جۆرێك لە بۆچونی سیاسیم هەیە بۆ بەڕێوەبردنی وەزارەتەکان، لە سەر جۆری دابەشکردنی زەویوزار، لە سەر جۆری دابەشکردنی موچە، من خۆم لایەنگری ئەوەم کە کۆمەڵێك سەبەب هەیە ناڕەزایی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا دروستکردوە، بەڕاستی هەموی لە دەست حکومەتدا نییە، بەڵام بەشێکی لە دەست حکومەتدایە، کە ئەبینی لە نێوان موچەی یەکەم و موچەی یانزەهەمدا سەد جار جیاوازیی هەیە، بێگومان ناڕەزایەتی دروست دەبێت، ئەمە بەمانای ئەوە نییە کە ناڕەزاییەکان کۆبکەینەوە، من باوەڕناکەم کەسێك هەبێت لە کوردستاندا لە وەزعەکە رازیبێت، بەڵام هەیە زۆرە هەیە کەمە.

**هاوڵاتی: بۆچی تائێستا خەڵکی ناو پارت و لایەنەکانی ترتان لە گەڵدا نییە، یان کەسی دیار و سەربەخۆ؟**
نەوشیروان: ئێمە تەماعی زۆر گەورەمان هەیە لەوەی کە خەڵکی بێلایەن، ئەوانەی کە قەت حیزبایەتیان نەکردوە، ئەوانەی کە لە ناو حیزبەکانی تردا بون، حاڵی حازر هەوڵدەدەین و پێشمانخۆشە، بەڵام هەوڵمان نەداوە کەس هەڵگێڕینەوە.

**هاوڵاتی: پڕۆژەکە وەکو هەروەکو یەکەمجار ماوە، کە جگە لە سەنتەرێکی لێکۆڵینەوە، کەناڵێکی ئاسمانیی بێت لە رۆژنامەیەک و سایتێکدا؟**
نەوشیروان: بەڵێ تائێستا هەر ئەوانەیە.

**هاوڵاتی: هەست ناکەیت بە قورسی دەستت داوەتێ و ئەوەش نیشانەی**

**ئەوە بێت کە هەموی نەکرێت؟**

نەوشیروان: ئەوەی کە تا ئێستا بڕیاردراوە لە سەری، ئەتوانین لە ماوەی چەند مانگێکدا جێبەجێی بکەین.

**هاوولاتی: هەنگاوە عەمەلیەکان تا کوێ هاتون؟**

نەوشیروان: ژێر خانە ئابورییەکەی ئامادەکراوە، جگە لەوە بینا و زەویمان بۆ دابینکردوە، ئەو کەسانەی کە ئامادەن کاری تێدا بکەن چ وەکو نوسەرو رۆژنامەوان، چ وەکو ستاف، لەگەڵ کۆمەڵێك کۆمپانیای بێگانەدا قسەمان کردوە چەند داوایەکیان داوینەتێ سەبارەت بە جۆری دروستکردنی ستۆدیۆ و دامەزراندنی تەلەفزیۆنەکە.

**هاولاتی: سەنتەری لێکۆلینەوەکە کارەکانی تا کوێ گەیشتوە؟**

نەوشیروان: لەم رۆژانەدا چەند پسپۆڕێکی بێگانە دێن بۆ ئەوەی پرسیان پێبکەین، هەیکەلی رێکخراوەیی سەنتەرەکە چۆن دابمەزرێنین، بەشەکانی چیبێت.

**هاولاتی: کەسەکان دیاری کراون بۆ سەرپەرشتیکردنی کارەکان؟**

نەوشیروان: بۆ کاروباری دەزگا ئیعلامیەکە کاك قادری حاجی عەلی دیاری کراوە، بۆ پێکهێنانی کاروباری سەنتەری لێکۆڵینەوەکە کاك حەمە تۆفیق رەحیم راسپێردراوە.

**هاولاتی: دەوری خۆت لە پرۆژەکەدا چی دەبێت؟**

نەوشیروان: بە زۆری پشتیوانیکردنی دەبێت.

**هاولاتی: چ جۆرە پشتیوانیکردنێک؟**

نەوشیروان: پشتیوانی کردن لە روی داراییەوە، لە روی سیاسیەوە، لەروی مەعنەوییەوە، ئەوەی کە بۆیشم بکرێت پاراستنیان دەبێت لە هەر دەستدرێژی کردنێك.

**هاولاتی: هێڵە سەرەکیەکان دانراون؟**

نەوشیروان: بەڵێ، بەڵام هێشتا وردەکاریەکانی ماون.

**هاولاتی: هەندێک خەڵک پێیان وابو کە لەناو بەرەکەتدا «ریفۆڕم»**

**چەند کەسێکت لە گەڵدابو کە خۆیان جێگەی پرسیار بون و گەندەڵ بون، ئایا ئەو شتە دوبارە نەبۆتەوە لە ناو ئەم دەزگایەدا؟**

نەوشیروان: بە داخەوە گەندەڵیی وەکو باران بەسەر خەڵکدا باریوە، من ئومێدم لەم پڕۆژەیەی خۆماندا یەکەم پڕۆفیشناڵیی، دوەم ناوبانگی باش، ئەمە بکەمە پێوەر بۆ دامەزراندنی خەڵکەکان.

**هاوڵاتی:خاڵی جیاکەرەوەی کەناڵەکەی ئێوە لەکەناڵە ئاسایەکانی تر دەچێت چی دەبێت؟**

نەوشیروان: ئەمانەوێت شتێك بکەین لە کەناڵەکانی تر جیاوازتر بێت، ئەو شتانە بکەین کە ئەوان نەیان کردوە، لە بەرئەوەی میللەتێکی بچوکین، کەناڵەکانمان تێکەڵە، ئەو کەناڵە هەوڵدەدەین کەناڵێکی هەواڵی بێت، بە زۆریی پشت بە هەواڵی کوردستانی، عێراقی، دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، جیهان، ناوچە گەرمەکان، ئەو وڵاتانەی کە تەجروبەی هەڵبژاردن دەکەن، زیاتر گرنگیی بدات بە شیکردنەوە، بە هەواڵ، کۆڕبەستن، هێنانی خەڵکی پسپۆڕ بۆ قسەکردن لە سەر ئەو پڕۆژە و روداوانەی کە دێنە پێشەوە.

**هاوڵاتی: ستۆدیۆی سەرەکی لە سلێمانی دەبێت؟**

نەوشیروان: بەڵێ مەرکەزەکەی لە سلێمانی دەبێت، بەڵام هەوڵدەدەین لە هەولێر، دهۆك، کەکوك، ئۆفیسی گەورەمان هەبێت، هەوڵدەدەین لە دەرەوەی وڵات ئۆفیسمان هەبێت، جۆرێك لە فەرهەنگی گشتی بدەینە بینەری کورد، بینەری کورد بخەینە پانۆڕامایەکی جیهانییەوە.

**هاوڵاتی: کەناڵە ئاسمانییەکە ناوی لێنراوە؟**

نەوشیروان: تا ئێستا ناومان لێنەناوە.

**هاوڵاتی: سایتەکە ناوی زەرگەتەیە، خەڵکی وا بیر دەکەنەوە کە ناوچەچێتییە، بۆ ئەو ناوەتان هەڵبژارد؟**

نەوشیروان: بە ناوی ئەو شوێنەیە کە لێیەوە بڵاودەکرێتەوە، شوێنەکەشمان هەر لە زەرگەتەیە، سلێمانی چەند کەرتێکی هەیە زەرگەتە یەکێکە لەو کەرتانە، ئاسایییە ناوی زەرگەتە بێت، زەرگەتە نیشانەی پاکی زەرگەتەیە نەك نیشانەی پێوەدانی بە

خەڵکەوە، ناوەکە من هەڵمبژاردوە، برادەرانیشم پێیان باشبوە.

**هاوڵاتی:رۆژنامەکە ناوی چی دەبێت؟**
نەوشیروان: هەندێ ناو پێشنیاز کراوە، بەڵام تا ئێستا ناوی لێنەنراوە، لە سەرەتاشدا رەنگە هەفتەنامە بێت.

**هاوڵاتی: تا چەند رۆژنامەکە رۆژنامە ئازادەکانی تر تێدەپەرێنێت؟**
نەوشیروان: ئەوە بەجێی دەهێڵین بۆ ستافی رۆژنامەکە، ئەوان ئەزانن چ جۆرێك هەڵدەبژێرن.

**هاوڵاتی: دەنگۆی ئەوەی هەیە کە ئەمە مینبەرێک بێت لە ناو یەکێتیدا، ئەمە تا چەند راستە؟**
نەوشیروان: نەخێر درێژکراوەی ئەوە نییە، بەڵام مینبەر ئەبو لەناو یەکێتیدا ئەبوایە لە چوار چێوەی یەکێتیدا بوایە، ئێمە پێمانوایە لەناو ئەو قەفەزە هاتوینەتە دەرەوە، ئەمانەوێت وەکو پرۆژەیەکی نیشتمانی بیخەینە گەڕ.

**هاوڵاتی: هەڵسوکەوتی مام جەلال چۆن دەبێت لەگەڵت؟**
نەوشیروان: ئەوەندەی من داوام لێکردبێت پشتیوانی لێکردوم.

**هاوڵاتی: ئەم پرۆژەیە دابڕانێک دروستدەکات لەگەڵ ژیانی رابردوتدا؟**
نەوشیروان: من هەرگیز ناتوانم لە رابردوی خۆم داببڕێم، بەڵام شێوازی ئیشکردنەکە لەگەڵ تەمەندا دەگۆڕێت.

**هاوڵاتی: مەبەستت لەوەیە کە پەشیمان نیت لە هیچ شتێکی رابردوی ژیانت؟**
نەوشیروان: شتە سەرەکیەکانی ژیانم، نەخێر، من یەکێکم لەو کەسانەی کە لە ژیانی خۆمدا هەمو ئەو شتانەی کە کردومن خۆم هەڵمبژاردون، بەڵام رەنگە لە شتی ورددا شت هەبێت لێی پەشیمان بم.

**هاوڵاتی: چی پلانێکی ئابوریتان هەیە کە وا بکات ئەم پرۆژەیە پێویستی بە یارمەتی نەمێنێت لە داهاتودا؟**

نەوشیروان: ئێمە هەوڵدەدەین هەندێك سەرچاوە بۆ خۆمان پەیدابکەین، جا لە ڕێگەی سەرمایەداران یان لە ڕێگەی خۆمانەوە بێت، بەڵام شتێك ناکەین کە پڕۆژەکەمانی پێ لە کەدار ببێت.

**هاوڵاتی: ئەکرێ بزانین میزانییەی پڕۆژەکە چەندە؟**

نەوشیروان: هێشتا پڕۆژەکە دەستی پێنەکردوە، کە دەستی پێکرد رایدەگەیەنین.

**هاوڵاتی: کەی پڕۆژەکەتان دەکەوێتە گەڕ؟**

نەوشیروان: پێموایە شەش مانگێکی تری دەوێت.

## ٩-١٢-٢٠٠٧

# شەرقولئەوسەت

# لە یەکێتییەوە بەرەو کۆمپانیای وشە

**ڕاگەیاندنی کوردی لاسایی ڕاگەیاندنی بەعس دەکاتەوە بۆیە هەوڵدەدەین دەزگایەکی ئازاد و سەربەخۆ دروست بکەین**

***سەرکردەی پێشوی یەکێتیی نیشتمانی: وازم لە یەکێتی هێنا لەبەر ئەوەی سەرکەوتو نەبوم لە گۆڕینی لە حیزبی کەسایەتیەکانەوە بۆ حیزبی موئەسەساتی**

سازدانی: (شەرقولئەوسەت)
دوای سی ساڵی بەردەوام کاری سیاسی و خەباتی چەکداریی لە ریزەکانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان کە یەکێك بو لە دامەزرێنەرەکانی، لە کۆتایی ساڵی ڕابردودا سیاسەتمەداری دێرینی کورد نەوشیروان مستەفا ئەمین بڕیاریدا واز لە پۆستەکەی وەك جێگری سکرتێری حیزبەکەی جەلال تاڵەبانی سەرۆك کۆماری عێراق بهێنێت بۆ ئەوەی دەسبەتاڵ بێت بۆ بەڕێوەبردنی دەزگایەکی گەورەی ڕاگەیاندن کە پێکهاتوە لە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە و سایتێك و کەناڵێکی ئاسمانی کە لە داهاتویەکی نزیکدا دەکەوێتە کار لەپاڵ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی بۆ خزمەت بە مەسەلەی کوردی بەشێوەیەکی گشتی.
ڕۆژنامەی شەرقولئەوسەت لە بارەگای سەرەکی دەزگاکەی ئەو کە دەکەوێتە سەر یەکێك لە گردە بەرزەکان لە ناوجەرگەی شاری

سلێمانی کە بەدارستان دەورەدراوە گفتوگۆیەکی لەگەڵدا کرد سەبارەت بە رۆڵی دەزگا راگەیاندنەکەی کە بە ناوی (وشە)وەیە و سەبارەت بە هۆکاری جیابونەوەشی لە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و چەند مەسەلەیەکی دیکەش.
بە پرسیارێك سەبارەت بە مەبەست لە ناوی دەزگاکەی دەستمان پێکرد و لەوەڵامدا وتی: «لەبەر ئەوەی هەمو کارێك لە ژیاندا بە وشە دەستپێدەکات کۆمپانیای وشەش دەزگایەکی راگەیاندنی سەربەخۆیە لەڕوی سیاسی و داراییەوە جیاوازە لە هۆکارەکانی دیکەی راگەیاندنەکان کە لەسەر گۆڕەپانی کوردستاندا هەن کە یان حیزبین یان حکومەتین، ئەوەی زانراوە کە گۆڕەپانی کوردستان و عێراق بێبەشن لە راگەیاندنی سەربەخۆ ئەمەش بە کەموکورتیەکی گەورە دادەنرێت سەبارەت بە وڵاتێك کە هەنگاو بەرەو دیموکراسی و ئابوری ئازاد دەنێت، بەڕای من ناتوانرێت سیستمێکی دیموکراسی بنیات بنرێت یان گەشە بە ئابوری ئازاد و پتەو و دور لە راگەیاندنی ئازاد و سەربەخۆ بدرێت، لەسەر ئەو بنەمایە هەوڵدەدەین لەڕێگای ئەم کۆمپانیایەوە دەزگایەکی راگەیاندنی ئازاد و سەربەخۆ دروستبکەین لەو هەلومەرجە سیاسیەی لە کوردستاندا هەیە».
سەبارەت بەوەی دەزگا راگەیاندنەکەی چی تازەی پێیە، نەوشیروان وتی: «هەندێك رۆژنامەی هەفتانەی سەربەخۆ لەکوردستاندا هەن، بەڵام میدیای سەربەخۆ بونی نییە، ئیمەش هەوڵ بۆ ئەوە دەدەین».
لەبارەی راگەیاندنی کوردیشەوە وتی: «پێشتر و چەندین جار و لە چەندین بۆنەدا وتومە راگەیاندنی کوردی تاڕادەیەکی زۆر لاسایی راگەیاندنی پێشوی بەعس دەکاتەوە کە ئەویش خۆی لاسایی ئەو راگەیاندنەی دەکردەوە کە لە کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشو و ئەوروپای خۆرهەڵاتدا هەبو کە راگەیاندن لەلایەن حیزبەوە قۆرخکرابو وەك ئەوەی ئێستا لە میدیاکانی سلێمانی و هەولێردا هەیە، هەرحیزبێك هۆکاری راگەیاندنی تایبەتی خۆی هەیە و ئەمەش وایکردوە کە راگەیاندنی سەربەخۆ بونی نەبێت».
سەبارەت بەگوتاری راگەیاندنی دەزگاکەی وتی: «کاتێك سایتەکەمان لە جەژنی نەورۆزی پێشودا دەستی بە پەخش کرد لەوێوە بنەما تایبەتەکانی دەزگاکەمان بڵاو کردەوە، وتمان کە ئێمە هەوڵدەدەین کار بکەینە سەر رای گشتی کورد بەئاراستەی بەدەستهێنانی زیاتری شەفافیەت و دیموکراسی و ئازادییە کەسیەکان و بەئاراستەی جیاکردنەوەی حیزب لە حکومەت و چالاککردنی رۆڵی دەزگا حکومییەکان و پتەوکردنی سەربەخۆیی دادگا و بەهێزکردنی

رۆڵی پارلەمان لە کوردستاندا، ئەمەش هێڵە گشتییەکانی گوتاری ڕاگەیاندنمانە کە هەڵقوڵاوە لە باوەڕمانەوە بە کۆتایی هاتنی شەڕی پارتیزانی و هاتنە کایەی کات و سەردەمی خەباتی مەدەنی کە پێویستی بە ڕاگەیاندنی ئازاد هەیە، بەتایبەت کە ئێمە بڕوامان وایە ڕای گشتی کوردی دەتوانێت کاریگاتە سەر سەرکردایەتی کورد بەئاراستەی بەدەستهاتنی زیاتری دیموکراسی و شەفافیەت و دژایەتی کردنی گەندەڵی دارایی و ئیداری و سیاسی کە لە وڵاتەکەدا بڵاوبوەتەوە، بەتایبەت کە کوردستان بەشێکە لە عێراق و گیرۆدەیە بەدەست گرنگترین دو کێشەوە کە تیرۆر و گەندەڵییە، بۆ خۆشبەختی ئێمە لە کوردستان بەدەست تیرۆرەوە ناناڵێنین، بەڵام بۆ بەدبەختی دەناڵێنین بەدەست گەندەڵییەوە، بەهەمو جۆرەکانییەوە و لە هەلومەرجێکی ئاوادا و لەوڵاتێکی وەکو وڵاتەکەی ئێمە، ئامانجی سەرەکی ڕاگەیاندنی ئازاد ئاشکراکردنی کەموکوڕییەکانی سیستمی سیاسی و خراپەکانی گەندەڵی ئیداریی و دارایی و سیاسییە.

وتیشی: «گوتارمان ئاراستەی گەلی کوردە بەپلەی یەکەم و دواتر پێکهاتە سەرەکییەکانی گەلی عێراق و دەست وەرنادەینە کاروباری گەلانی تری ناوچەکە».

لەبارەی ئاستی سەرکەوتنی ڕاگەیاندنی کوردی لەدروستکردنی ڕای گشتی نەوشیروان وتی: «بەدڵنیاییەوە ڕاگەیاندنی کوردی توانیویەتی ڕایەکی گشتی لە کوردستان دروستبکات، کەناڵەکانی ڕاگەیاندن جەماوەر ئامادە و هاندەدەن بەشداریی لەو هەڵبژاردنانەدا بکەن کە بەڕێوەدەچێت، بەڵام بۆچی دەستنیشانی نەخۆشی و کەموکوڕییەکان ناکەن؟ ئەوە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان حکومەتێکی هاوپەیمانییە و هەمو حزبە کوردییەکان بەشداریی تێدادەکەن، بەو مانایەی هیچ ئۆپۆزسیۆنێکی حیزبی لە پارلەماندا نییە، لەبەرئەوە سروشتییە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بکەونە ستایش و پشتیوانیکردنی دەسەڵات لە ڕوانگەی ئەرکی حزبایەتییانەوە».

لەبارەی ئەو پێوەرانەی دامەزراوەکەی لە هەڵبژاردنی کادیرەکانیدا ڕەچاوی دەکات، وتی: «ڕەچاوی پیشەگەریی و شارەزایی و نێوبانگی باش دەکەین و بەهیچ جۆرێك گوێ نادەین بەئینتیمای حزبی، پەخشی کەناڵە ئاسمانییەکەمان کە تائێستا ناومان نەناوە لەماوەی چەند مانگی داهاتودا دەستپێدەکات و جیاواز دەبێت لەو کەناڵانەی ئێستا لە گۆڕەپانی ڕاگەیاندنی کوردیدا هەن و تەنیا جەخت لەسەر هەواڵ و شیکردنەوەی سیاسی و بەرنامەی دیکۆمێنتاری دەکاتەوە، بەو مانایەی کەناڵێکی هەواڵی دەبێت».

سەبارەت بەسەرچاوەی دارایی دامەزراوەکەی، نەوشیروان وتی: «لەسەرەتای کارەکانمانەوە توانیومانە هەندێ سەرمایە بەدەستبهێنین کەخراپ نییە بۆ بنیاتنانی ژێرخان و ژمارەیەك دەوڵەمەند و خاوەن کاری کوردیش بەڵێنیان پێداوین پارە بۆ دامەزراوە و پرۆژەکەمان خەرج بکەن، ئەوەش لانی کەم بەشی ۲ بۆ ۳ساڵ دەکات».

لەبارەی هۆکاری جیابونەوەی لە یەکێتیی نیشتمانی کوردستان کە خۆی یەکێکە لە دامەزرێنەرانی، نەوشیروان وتی: «هەوڵمدا لەڕێی هەڵبژاردنی ناوخۆیی یەکێتیی نیشتمانییەوە، پێکهاتەکەی لە دامەزراوەیەکی کەسایەتییەوە بگۆڕم بۆ حیزبی دامەزراوەیی و چەسپاندنی شەفافیەت و کردنی بە پێڕەویی سیاسی و هەڵبژاردن ئامرازێکی سەرەکی بێت بۆ گۆڕینی دامەزراوە سەرکردایەتی و کادیرەکانی، بەڵام لەو هەڵمەتەدا شکستمهێنا بۆیە بڕیارمدا لە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان جیاببمەوە».

لەبارەی هەڵسەنگاندنی سیاسەتی کوردی، نەوشیروان وتی: «بێزاری هەیە لەناو خەڵکدا لەسەر زۆر شت و منیش یەکێکم لە بێزارەکان، بەوتەیەکی تر دەتوانین بڵێین کەسیاسەتی کوردی و سەرکردایەتی کورد بەئاراستەیەکی هەڵە دەڕوات».

لەبارەی دیدی خۆی بۆ ئایندەی سیاسی کوردستانی عێراق، وتی: «پێموایە لێپرسراوانی کورد لە کوردستان لەهەمان کاتدا بەرپرسیارن لەڕەوشی ئێستای عێراق، لەو باوەڕەدام کە ئەرکی سەرشانی هەمو هاوڵاتییەکی کوردە لەهەر شوێنێك بن پاڵپشتی لە حکومەتی هەرێمی کوردستان و دامەزراوەکانی بکەن و پشتیوانی بن و بیانو و پاساو نەدەنە دوژمنان دژایەتی ئەم ئەزمونە بکەن، پێشموایە کە سەرکردایەتی کورد پێویستە جەخت بکاتەوە لەسەر چەسپاندن و بەهێزکردنی دامەزراوەکانی حکومەتی هەرێم و ئەمە بکاتە ئامانجێکی سەرەکی».

لەبارەی ئەگەریی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ی تایبەت بەئاساییکردنەوەی رەوشی کەرکوك، نەوشیروان وتی: «مەحاڵە لەو وادەیەی لەخشتەبەندی جێبەجێکردنەکەیدا ماوە جێبەجێ بکرێت، ئەمەش یەکێك لە هەڵەکانی سەرکردایەتی کورد بو بەوەی هەنگاوەکانی جێبەجێکردنی ئەو ماددە دەستورییەی لەوادەی دیاریکراوی خۆی لەسەرەتاوە فەرامۆش کرد، رەنگە بەشدار و بەرپرسیاربم لەو هەڵەیە بەهەمان شێوە، دان بە بەرپرسیارێتی خۆم لەو روەوە دەنێم و لە بەرپرسیارێتی هەڵنایەم».

## ١٨ -١- ٢٠٠٨

# سایتی ئیلاف

**نەوشیروان مستەفا:**
**ئێستا لە نێوان من و تاڵەبانیدا ناکۆکی هەیە**

سازدانی: نزار جاف - (ئیلاف)

هەرچەندە ئێستا بە شێوەیەکی رەسمی پۆستی جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ئەستۆدا نییە، بەڵام هێشتا کەسایەتی بەرێز نەوشیروان مستەفا نەك هەر لە لایەن یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە، بەڵکو لە لایەن هەمو حیزبە کوردستانیەکانی دیکەشەوە حسابێکی تایبەتی بۆ دەکرێت لە گۆڕەپانی سیاسیی کوردستاندا و زۆربەی لێکۆڵەر وچاودێرانی سیاسیش بەچاوێکی تایبەتەوە دەڕواننە کاریگەری ئەم سیاسەتمەدارە لەسەر ئایندەی سیاسیی هەرێمی کوردستان، «ئیلاف» بە کۆمەڵێك پرسیارەوە ئەم چاوپێکەوتنەی لە گەڵدا سازداوە.

**ئیلاف: پرسیارێک کە زۆر دەکرێت ئەوەیە، بۆ نەوشیروان مستەفا وازی لە کاری سیاسیی هێنا لە ریزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا؟.**

نەوشیروان مستەفا: من پێموایە کاری سیاسیی و کاری حیزبی دو شتی جیان لە یەکتری، دەتوانیت کاری سیاسیی بکەیت و ئەندامی هیچ حیزبێکی سیاسیش نەبیت، هەروەها دەتوانیت سیاسیی بیت

کاری سیاسییش نەکەی، من لە کاری حیزبی دورکەوتومەتەوە، بەڵام بە ئازادیەکی زیاترەوە لە کاری سیاسیی نزیك بومەتەوە.

**ئیلاف: پەیوەندیتان لە گەڵ سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەڕێز جەلال تاڵەبانی چۆنە، ئایا ئەو قسانەی دەکرێت سەبارەت بە بونی کێشە لە نێوان ئێوەو ئەودا راستە؟**

نەوشیروان مستەفا: پەیوەندی من و مام جەلال پەیوەندییەکی ٤٠ ساڵەیەو پەیوەندیەکی هاوڕێیەتی و خۆشەویستیە، هەندێك جار بیرکردنەوە و بۆچونەکانمان وەك یەك بوە، بەڵام هەندێك جاریش جیاواز بوە، ئێستا لەو کاتانەیە کە بۆچون و بیرکردنەوەم سەبارەت بە زۆر شتی گرنگ لەگەڵ بیرکردنەوە و بۆچونەکانی ئەودا ناکۆکن. بەڵام لەسەر ئاستی شەخسیی پەیوەندییەکانمان وەك جاران باشەو کێشەمان نییە.

**ئیلاف: لە نوسینەوەی بیرەوەرییەکانتان لە مەجلسی حوکم، پەردەتان لە سەر ئەو قۆناغە لە مێژوی سیاسیی عێراق هەڵدایەوە، ئایا ئەوەی ئێستا لە بەغدا ئەگوزەرێت دوبارە بونەوەی هەمان ئەو سیناریۆیەی سەردەمی مەجلس نییە، بەڵام بە هەندێک گۆڕان و جوانکارییەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: بارودۆخی ئێستای عێراق درێژەی ئەو پرۆسە سیاسییەی قۆناغی مەجلسی حوکمە لە گەڵ هەندێك گۆڕانکاری کە روداوەکانی ناوخۆی عێراق و وڵاتانی دەوروبەر سەپاندویانە.

**ئیلاف: شەقامی عەرەبی بە چاوی گومانەوە دەڕواننە بەشداریکردنی سیاسەتمەدارانی کورد لە پرۆسەی سیاسیی عێراقدا و پێیان وایە ئامانجی کۆتایی کورد بریتیە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی و دابەشکردنی عێراق، ئێوە لەو بارەوە چی دەڵێن؟**

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر بە چاوی گومانەوە بڕواننە ئامانجەکانی گەلی کورد، تێڕوانینی شەقامی عەرەبی بۆ ئینسافی تێدایە، بۆ عەرەبەکان ئەو مافە بە خۆیان رەوا دەبینن زیاتر لە ٢٠ وڵاتیان هەبێت، کەچی بە کورد رەوا نابینن ئەو مافەی هەبێت؟ ئەگەرچی ئێستا کورد لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا رۆڵی نییە، بەڵام لە ئایندەدا دەبێتە لایەنێکی سەرەکی و کاریگەر لە ناوچەکەدا، بەرژەوەندی عەرەب لەوەدایە دۆستایەتی کورد بکات، نەك گومانی لێ بکات.

**ئیلاف: کورد هاوپەیمانی شیعەکانە، یان بە مانایەکی دیکە پەیوەندی ناراستەوخۆیان بە هاوپەیمانی شیعەوە هەیە و لەگەڵ ئیرانیەکانیشدا ریکەوتن، وەک دەزانن شیعەو ئێران بونەتە ئامانج بۆ زۆر وڵات و لایەنی دیکە، پێتان وانییە ئەو پەیوەندیە لە ئایندەدا بە زیان بۆ سەر کورد دەشکێتەوە و ئایا هەڵبژاردنی پەیوەندیەکی لەو شێوە هەڵەیە؟**

نەوشیروان مستەفا: مەرج نییە ئەمەریکاو ئیران دژایەتی یان دۆستایەتی کێیان کرد، کوردەکانیش لەوەدا لاساییان کەنەوە، بەرژەوەندی کورد لەوەدایە هاوسەنگی لە نێوان شیعەو سونە و واشنتۆن و تاراندا راگرێت.

**ئیلاف: تا چەند متمانەت بە هاوپەیمانێتی ئەمەریکا لەگەڵ کوردەکاندا، پێتان وانیە سیناریۆی ١٩٧٥ دوبارە بێتەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا شتێك نییە بە ناوی راستگۆیی یان متمانە یان مەبادئیەوە، ئەوەی لەبەرچاو دەگیرێت بەرژەوەندی نەتەوەیی و ئاسایشی نەتەوەیی و هاوسەنگی نەتەوەییە. جیهانی ئەمرۆ و پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکانی ئێستا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گۆڕاون، جیهانی ئێستا جیهانی ١٩٧٥ نییە، بۆیە سیناریۆی ١٩٧٥ دوبارە نابێتەوە، ئەگەر شتێکی دیکە روبدات گومانی تێدا نییە سیناریۆکەی جیاوازە و شتێکی نوێ دەبێت.

**ئیلاف: BBC لە راپۆرتێکی سەبارەت بە تەشەنەسەندنی گەندەڵی لە هەرێمی کوردستان بڵاوکردەوە، ئەو راپۆرتە دوای چەندین راپۆرتی تر لەوبارەوە هات، وەک سیاسەتمەدارێکی ئاگادار، چۆن دەڕواننە ئەو دیاردەیە، ئایا هێڵی سوری تێپەڕاندوەو تازە گەڕانەوەی بۆ نییە؟**

نەوشیروان مستەفا: گەندەڵی و تیرۆر دو مەسەلەن روبەڕوی عێراق بونەتەوە، کوردستان تاوەکو ئێستا بە شێوەیەکی باش دورە لە تیرۆر. بەڵام گەندەڵی بە هەمو شێوەکانی لە کوردستاندا هەیە، گەیشتوەتە ئاستێکیش ئەگەر چارەسەر نەکرێت، هەڕەشە لە ئایندەی سیاسیی هەردو حیزبی دەسەڵاتدار دەکات و دور نییە ئەزمونی فەتح و حەماس لە کوردستاندا دوبارە بێتەوە.

**ئیلاف: ئەو هەواڵانەی لە کوردستانەوە دێن باس لەوە دەکەن زۆربەی**

**سیاسەتمەدارانی کورد سەرقاڵی کاری بازرگانین و دەستیان بەسەر بازاڕەکاندا گرتوە(!)، بەڵام ئێوە بە پێچەوانەی ئەوانەوە سەرقاڵی کاری ڕۆشنبیریین و دەزگای وشە بۆ ڕاگەیاندنتان دامەزراند، بۆ ئەو بوارەتان هەڵبژارد؟**

نەوشیروان مستەفا: یەکێك لە گرنگترین کەموکۆڕیەکانی ئەزمونی دیموکراتی لە کوردستانی عێراق نەبونی ڕاگەیاندنێکی سەربەخۆ و پیشەییە، گرنگترین کۆڵەکەی سەرەکی ژیانی دیموکراسیی، بونی ڕاگەیاندنێکی ئازاد و شەفافە، ئێمە لە هەوڵی ئەوەداین ئەو بۆشاییە لە کوردستان پڕکەینەوە.

# ئایاری ۲۰۰۸

# The Middle East

**نەوشیروان مستەفا:**
**دەمەوێت چاکسازیی لە حکومەت و پەرلەماندا بکەم**

راپۆرت: کریس کۆچێرا

دەنگە ئۆپۆزسیۆنەکە لەمیانی چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ کریس کۆچێرا، نەوشیروان مستەفا جێگری سکرتێری گشتیی یەکێتی ئێستا بوەتە خاوەن رۆژنامەو هۆکارەکانی راگەیاندن، بەراشکاوی باس لەپێویستی چاکسازیی لەحکومەتی کوردیدا دەکات.

بە»منداڵە ترسناکەکەی» بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی عێراق ناسراوە. نەوشیروان مستەفا گەیشتوەتە پایەی بەرز لەسلێمانی. پێشتر ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیو جێگری سکرتێری گشتیی ینك بوە.

جگە لەجەلال تاڵەبانی کەئێستا لەهەمان کاتدا سەرۆکی کۆماری عێراقە، لەدامەزراندنییەوە ئەو سکرتێری یەکێتییە. هاوکات سکرتێری یەکێتییە. کاتێك لەمانگی شوباتی ۲۰۰۷دا، بریاریدا وازبهێنێت ببێت بە چەکدارێکی سادە. ئەو چەکدارە سادەیەی کە ئێستا رۆژنامەیەك دەردەکات بەناوی رۆژنامە، هاوکات سایتێکی جەماوەریشی هەیە کەتیایاندا بە راشکاوی باس لەو شتانە دەکات کە زۆرێك لەخەڵکی تەنانەت ناتوانن بەچرپەش باسی لێوە بکەن. ئێستا خۆی ئامادە دەکات بۆئەوەی تەلەفزیۆنێکیش بخاتە کار KNN (کەناڵی تۆڕی

هەواڵی کوردی) بۆئەوەی هەواڵ پەخش بکات بەڵام نەك بۆ گۆڕانیو سەما ئەو بەدڵنیایی تەواوە دوپاتی دەکاتەوە.

«کاتی ئەوە هاتوە کەجەخت بکەینەوە لەسەر مەسەلە ناوخۆییەکان» نەوشیروان مستەفا لەماڵەکەی خۆیدا لەسلێمانی «من ئەوە دەڵێم کەپێویستە بیڵێم بەڵام بەدەنگێکی دۆستانە. من ئۆپۆزسیۆن نیم. پەیوەندی باشم لەگەڵ هەردو جەلال تاڵەبانیو مەسعود سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان هەیە.

ئێمە بەیەکەوە قسە دەکەین. من هاورێیانم نەك دوژمنیان. دەمەوێت چاکسازیی لەحکومەت، لەپەرلەمان، لەو بیرۆکراسیەتەی هەیە بکەم. واباشترە کە کێشەیەك دەبێت گفتوگۆی لەبارەوە بکرێت».

یەکەم ئاستەنگ وەك نەوشیروان مستەفا دەڵێت نەبونی خزمەتگوزارییەکانە. کوردەکان ئەوە بۆ ماوەی ١٧ ساڵ دەچێت حوکمڕانی خۆیانن. تا ئێستاش چەند مەسەلەیەك پێویستە بەڕاشکاوی باسیان لێوەبکرێت. تا ئێستا نەبونی کارەبا رێگرە لەوەی کوردەکان کارە بازرگانییەکانیان رایی بکەن.

حکومەت رۆژانە تەنیا سەعاتێك کارەبا دابین دەکات. ئەوانەی توانایان هەیە ٧ بۆ ٨ سەعات کارەبا لەخاوەن مولیدەکان دەکڕن. ئەوانەی تریش پێویستە مشوری خۆیان بەبێ کارەبا بخۆن. وەکو دەرکەوت لەو پەتای کۆلێرایەی کە بەم دواییانە لەسلێمانی بڵاوبوەوە، ئاویش کێشەیەکی گەورەیە. لەهەمان کاتدا کێشەی نیشتەجێبون هەیە. کرێ خانو رۆژ بەرۆژ بەخێرایی موشەك بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە، گەنجەکان توانایان نییە کە ژن بێنن دەبێت خۆیان ئامادە بکەن لەگەڵ دایكو باوکیاندا بژین، ژێرخانی ئابوری پشتگوێخراوە. کێشەی نەبونی قوتابخانە هەیە تەنانەت لەشارە گەورەکانیشدا. «لەسلێمانی قوتابخانەمان هەیە کە چوار دەوامی تیادایە. ئەمە چۆن مەعقولە لەکاتێکدا کەبودجەی هەرێمەکە ٦ ملیار دۆلارە؟» مستەفا دەپرسێت و بەڕاشکاوی باس لەو هەستە بەرفراوانە دەکات کەهەیە.

کێشەیەکی تر کە نەوشیروان مستەفا دەڵێت نەبونی شەفافیەتە لەبەڕێوەبردنی کاروباری حکومەت. «شەفافیەت لەمەسەلەکانی بودجەدا نییە. خەڵکانی ئاسایی هیچ شتێك نازانن لەبارەی بودجەی ینكو پدکەوە یان بودجەی کەرتی خوێندن. خەڵکی چی دەزانێت لەبارەی گرێبەستەکانەوە. شەفافیەت نییە لەکاروباری دەرەوەدا،

هیچ کەس نازانێت چی هەیە لەنێوان سەرانی کوردو بەغدادا، یان لەنێوان سەرانی کوردو ئەمەریکا».

«من لەبارەی بودجەوە زانیاریم هەیە، لەبەرئەوەی پێشتر بەشێك بوم لەو سەرکردایەتییە، من یەکێك بوم لەوان» ئاماژەی بەوەدا، وتیشی: «بەڵام ناتوانم بەتۆی بڵێم لەبەرئەوەی نامەوێت کێشە دروست بکەم، جارێکی تر دوپاتی دەکەمەوە من دوژمنی جەلال تاڵەبانیو مەسعود بارزانی نیم. دەمەوێت کەکارەکان بەئاشکرا بکەن ئەوە لەبەرژەوەندی خۆیانە کەوا بکەن. دەمەوێت خواستێکی راستەقینە بۆ چاکسازی لەناو رای گشتیدا دروست بکەم».

نەوشیروان مستەفا بەردەوامە لەدەستنیشانکردنی ئەو کێشە گەورانەی کە روبەڕوی کۆمەڵگای کوردی دەبنەوە وەکو گەندەڵی. «من تەنیا باس لەگەندەڵی ناکەم. بەڵکو خزم خزمێنەو مەحسوبیەتیش». ئەو دەڵێت: «ئەگەر تۆ نزیك نەبیت لەپارتیو یەکێتی، هەلی ئەوەت نییە ببیت بەوەزیر یان جێگری وەزیر. پارتەکان دەستیان لەمیدیاکانو لە دەسەڵاتی دادوەریش وەرداوە. دادوەرەکان لەلایەن پارتەکانەوە دادەنرێن، پارتەکان دەستیان بەسەر هەمو شتێکی کۆمەڵگادا گرتوە، ئێمە سیستمێکی تۆتالیتاریمان هەیە وەکو بلۆکی سۆڤیەتی پێشو یان رۆمانیای کۆن».

«بەدڵنیاییەوە من شانازیی بەوەدەکەم کەچیمان بەدەستمان هێناوە، ئێمە حکومەتمان هەیە، پەرلەمان، بەڵام ئێستا کاتی خۆیەتی کە بەڕاشکاوی قسە لەبارەی کێشەکانەوە بکەین، حیزب هەمو کەسێك دەستنیشان دەکات، هەر لەسەرۆکی ئەنجومەنی گوندێکەوە تا پارێزگارەکان، تەنانەت سەرۆکی زانکۆکانیش» وەکو نەوشیروان مستەفا دەڵێتو گوزارشت لەو هەستە خەماوییە دەکات کەهەستی پێدەکرێت لەلایەن زۆرینەی دانیشتوانەوە، لە گەنجێکی خوێندکار کەمافی دەنگدانی هەیە تا رۆژنامەنوسە رەخنەگرەکان.

نەوشیروان مستەفا ئیدیعا دەکات کەتەنانەت قبوڵکردنی خوێندکارانیش بۆ بڕوانامەی دکتۆرا پشت بەحیزب دەبەستێت. «تەنیا ئەوە بەس نییە تۆ ئەندامی حیزب بێت بەڵکو لەناو سەرکردایەتی حیزبەکە دەبێت پشتیوانیت لێبکەن». لەسلێمانی مەکتەبی رێکخراوە جەماوەرییەکان دەستی گرتوە بە سەر کارەکانی سەندیکاو رێکخراوە مەدەنییەکان. «تەنانەت سەرۆك وەزیران وەزیرەکانی هەڵنابژێرێت»، مستەفا ئیدیعا دەکات «حیزبەکان ئەوەدەکەن. باڵو لایەنەکانی ناو حیزبەکان».

ئیدیعای ئەوە دەکات کە ١٠٠ پلە جیاوازی هەیە لەنێوان بەرزترین

موچەو نزمترین موچەی حکومیدا. سەرۆکی پێشوی کۆمەڵە ڕێکخراوی ماویستی کورد. رونی دەکاتەوە «کۆمەڵگەکەمان دابەش بوە بەسەر دو چیندا، چینێکی زۆر دەوڵەمەندمان هەیە، چینێکی زۆر هەژار لەکۆمەڵگەیەکدا کەخەباتکارانی ئازادیی گۆڕاون بە پیاوانی دەوڵەت».

پرسیارمان لێکرد بۆچی ینك لەپاییزی رابردو پاڵێوراوی خۆی بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران لەحکومەتی هەرێمی کوردستان نەپاڵاوت وەکو ئەوەی لەڕێککەوتننامەی ستراتیژی نێوان هەردوکیاندا هاتبو، بۆچی ینك قبوڵی کرد کە نێچیرەڤان بارزانی لەپارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆك وەزیران بمێنێتەوە نەوشیروان مستەفا زۆر سەرنجڕاکێشانە خۆی لێلاداوەو ئامادەنەبو لەوبارەیەوە هیچ بڵێت. «من یەکێکم لەدامەزرێنەرانی ینك لەساڵی ١٩٧٦، بۆیە ناتوانم بەڕاشکاوی باس لەهەندێك کێشەی دیاریکراو بکەم، ئیلیتزاماتی ئەخلاقیم هەیە.

ئەو تەنیا وەکو خۆبەخشێکە «خەڵکی پەیوەندی بەوەوە نییە کێ سەرۆك وەزیرانیانە، کەسێکیان دەوێت کە خزمەتگوزارییان بۆ دابین بکات، دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بۆ فەراهەم بکات، خەڵکی چاوەڕوانیان دەکرد کەدوای یەکگرتنەوەی هەردو ئیدارەکەی ینك‌و پدك گۆڕانکاریی بکرێت بەڵام هیچ گۆڕانکاریی نەبو».

«ئۆپۆزسیۆن نییە لەکوردستان» نەوشیروان مستەفا بەڕامانەوە دەڵێت: «هەمو پارتە سیاسییەکان بەگەورەو بچوکەوە بەشدارن لەحکومەتدا. وا پێویست بو بەیەك دەنگ لەبەغدا قسە بکەین تا ئەو کاتەی دەستوری عێراق دەنوسرێتەوە، بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتوە کە بەڕاشکاوی قسە بکەین».

«ساڵی ١٩٤٤ لەسلێمانی لەدایکبوە، لە ١٩٦١ پەیوەندیم بە پدکەوە کردوە لەتەمەنی ١٧ساڵی، کاتێك کە جەلال تالەبانی نوسینگەی پدکی لەسلێمانی کردەوە لەسەردەمی قاسم. ئێمە نەوەیەکی بەختەوەرین، سەرکەوتنمان بینی، ئازادی وڵاتەکەمان بینی، شێخ مەحمود بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ شارەکەی خۆی لێ یاساغ بو، شێخ سەعیدو قازی محەمەد هەڵواسران. جەنەراڵ بارزانی لەئاوارەیی مرد. ئێمە لۆردی وڵاتەکەی خۆمانین».

تێبینی: ئەم دیمانەیەی نەوشیروان مستەفا کە لەلایەن کریس کۆچێراوە لە شاری سلێمانی سازدراوە، بە شێوەی راپۆرت لە ژمارە ٣٨٩ ی مانگی ئایاری گۆڤاری The Middle Eastی لەندەنیدا بڵاوکراوەتەوە.

## ٢٨-٧-٢٠٠٨

# گفتوگۆی نەوشیروان مستەفا لەگەڵ رادیۆی نەوا

**نەوشیـروان مستـەفا: کەرکوکمان نەدۆڕاندوە**
**«کورد نەیتوانی نمونەیەکی باش بدات بە نەتــەوەی تورکمانو نەتەوەی عەرەب لە کەرکوکدا»**

دیمانە: رادیۆ نەوا
سەبارەت بە دوا گۆڕانە سیاسییەکانی پەیوەندی کورد و بەغدا و یاسای پەسەندکراوی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی پارێزگانی عێراق و سەرجەم ئەو ململانێیانە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق سەرکردایەتی کوردی لە بەغدا پێیدا تێپەڕبوە و ئەو مافە دەستوریانەی کورد کە لە دەستوری عێراقدا چەسپیوە و ئەو رێکەوتنانەی کە سەرکردایەتی کورد لەگەڵ سەرکردەی لایەنە سیاسییەکانی عێراق هەیەتی و چەند مەسەلەیەکی تری پەیوەست بە کوردەوە، رادیۆی نەوا دیمانەیەکی لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا سازکرد، کە ئەمە دەقەکەیەتی...

*** هەرکاتێک باسی کەرکوک بکەین لەدوای پرۆسەی ئازادیی عێراقەوە، ناتوانین هەردو مادەی ١٤٠و ٥٨ فەرامۆش بکەین، جێبەجێنەکردنی مادەی ١٤٠ وەکو ئیستیحقاقی هەڵبژاردن لای تۆ چ سورەتێک دروستدەکات؟**
نەوشیروان مستەفا: لە راستیدا یەکێك لە هۆیەکانی ئەوەی

که هاوپەیمانی کوردستانی موافەقەتی نەکرد لەسەر ئەوەی که دکتۆر جەعفەری درێژە بە ئیشەکانی بدا وەکو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لە عێراقدا، ئەو تەقصیره بو که درایه پاڵی سەبارەت بە جێبەجێنەکردنی مادەی ١٤٠ی دەستوری عێراقی، هاوپەیمانی کوردستانی بەو مەرجە لەگەڵ نوری مالیکیو لیستی ئیئتلافی یەکگرتو رێککەوتن که جەدوەلێکی زەمەنی دابنرێت بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ی دەستوری عێراقیو جەدوەله زەمەنییەکه که وایان دانا تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ جێبەجێ بکرێت.

نوری مالیکی که هەڵبژێردرا بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، هاوپەیمانی کوردستانی بەو مەرجە موافەقەتی کرد ببێتە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لەو ماوەیەدا ئەو مادەیە جێبەجێ بکات، وەکو گەرەنتییەکیش بۆ جێبەجێکردنی ئەومادەیە رێککەوتنێك ئیمزاکرا لەبەینی لیستی هاوپەیمانی کوردستانیو لیستی ئیئتلافی یەکگرتوی شیعە، بە گوێرەی ئەو رێککەوتنە هەرکاتێك وەزیره کوردەکان بکشێنەوە لە وەزارەتەکەی، ئەوساکە حکومەتەکەی نوری مالیکی بە هەڵوەشاوە حساب بکرێت. نوری مالیکی یاخود لیستی ئیئتلافی یەکگرتو، که زۆرایەتییان هەیە ئەبو برۆنەوە بۆ بەردەمی پەرلەمان سەرلەنوێ دەستبکەن بە گفتوگۆ لەگەڵ هەمو کوتلە پەرلەمانییەکانی ترو لەگەڵ گروپەکانی تردا، بۆئەوەی وەزارەتێکی تازە پێکبهێنن. ئەم مەرجەی که لیستی هاوپەیمانی کوردستانی دایناب بۆ بەشداریکردن لە وەزارەتەکەی نوری مالیکی نە کوتلەی سەدریو نە تەوافوقو نە حیزبی فەزیله ئەم رێککەوتنەیان نەبو لەگەڵ نوری مالیکی، تەنیا لیستی هاوپەیمانی کوردستانی هەیبو.

من بەداخەوە ئەڵێم که کوتلەی کوردی لە وەزارەتەکەی نوری مالیکی نەیتوانی بەچاکی ئیستیفادە لەم چەکە قانونییو سیاسیه بکات، که رێککەوتنێکی بەینی ئەو دو کوتلەیە بو، ئەمەیان بکردایە بەهۆیەك بۆ پەلەکردن لە جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ لەکاتی خۆیدا بۆئەوەی ئیلتیزامی هەبوایە بەرامبەر بەوەی کاتی خۆی لەسەری رێککەوتبون.

*** بەو ئیعتیبارەی که حیزبی دەعوەی ئیسلامی عێراقی بەشێکه لە لیستی ئیئتلافی یەکگرتو، ئەوانیش لە رێککەوتنەکەدا هەبون، ئایا**

**مولزەم بون پێوەی؟**

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ هەمویان، چونکە ئەو رێککەوتنە لە نێوان هاوپەیمانی کوردستانی بە هەمو لایەنەکانیەوەو ئیئتلافی یەکگرتو بە هەمو لایەنەکانیەوە بو.

***کاک نەوشیروان، کاتێک تێبینی دەکەین کە نە عەلاوی، نە جەعفەری، نەمالیکی، کە سێ کەسایەتی جیاوازنو سەر بە سێ ئینتیمای تا رادەیەک جیاوازن لەسەر ئاستی عێراق، لە سەردەمی دەسەلاتی هەر سێکیاندا ئەم مادەیە جێبەجێنەکراوە، ئەمە پەیوەندی بە شەخسێکەوە نیە بەڵکو بارودۆخی عێراق ئەو زەمینەیەی جێبەجێکردنی ئەو مادەیەی نەبوە؟**

نەوشیروان مستەفا: رەنگە کۆمەڵێك هۆکاری هەبن یەك هۆکار نەبێت، رەنگە کەگلەیی لە وەزیرەکانی عەرەب یان لە سەرۆکی وەزیران بکەینو بڵێین عێراق کێشەی زۆرەو نەمان پەرژاوەتە سەر ئەو، ئەولەویاتی جیاوازە، بەڵام لە راستیدا میللەتان بە هیچ جۆرێك دەست لە ئەرزی خۆیان هەڵناگرن، تەنانەت وڵاتێکی وەکو ئیسرایل کە گۆلانی داگیرکردوەو هەندێ زەوی داگیرکردوە دوای ساڵی ١٩٦٧و دوای ١٩٧٣ ئامادەنیە بە خۆشی دەستی لێبەربدات، ئەوا لەکاتێکدا ئەرزی خۆی نیەو وازی لێناهێنێت. ئەمانیش وەکو پارچەیەك لەعێراق بڕواناکەم ئەگەر زەختی کوردیان لەسەر نەبێت هیچ کەسێك لەوانەی کە عەرەبن ئامادەنین بەئاسانی دەست لە هیچ پارچەیەکی کەرکوك یان خانەقین یان سنجار یان هیچ جێگایەکی تر هەڵبگرن، بەڵام دەبێت کورد خۆی سوربێت لەسەر ئەوەی کە چۆنی وەردەگرێتەوە. رێگەوشوێن دابنێت، نەخشە دابنێت، خەڵکی بۆ تەرخان بکات، پلانێك دابنێت بۆئەوەی کە ئەو ناوچانە چۆن وەردەگرێتەوەو دەیهێنێتەوە سەر هەرێمی کوردستان. میللەتانی دنیا بۆ نمونە قەتەرو عەرەبستانی سعودیە کە هەردوکیان عەرەبن لەسەر ناوچەیەکی بچوك کەجێی مەخفەرێکی پۆلیسی تیایە ناکۆکن، بەینی ئیماراتو سعودیە ناکۆکیی تیایە لەسەر سنور، بەینی هەمو میللەتی عەرەبو ئێران ناخۆشە لەسەر سێ دورگەی چۆڵ کە کەسی تیانازێ، ناکۆکی بەینی مەغریبو ئیسپانیا لەسەر دورگەیەکە دە قاچاخچی بەکاری دەهێنێت. جاری واهەیە ئەو ناکۆکیانە بۆ نمونە لە یۆگسلاڤیای پێشودا دو نەتەوە شەڕیان کرد لەسەر جادەیەك ئەو دەیوت ئەو

جادەیە هی منەو ئەوی تریان دەیوت هی منە، مەبەستم ئەوەیە وا بە ئاسانی عەرەب لە عێراقدا دەست لە کەرکوك‌و شوێنەکانی تر هەڵناگرن. لەبەرئەوە کوردیش دەبێت دەستی لێهەڵنەگرێت، بەڵام ئەوەی دەبێت سوربێت لەسەری کوردە، بۆئەوەی سود لە زەماناتی دەستوری، لە زەماناتی قانونی بکات، لە رێککەوتنەکانی نێوان خۆی‌و گروپەکانی تر بکات بۆئەوەی فشارێکی قانونی‌و سیاسی دروستبکات، بۆئەوەی وەرەقەکانی خۆی هەمو بەکاربێنێت بۆئەوەی ناوچەکان وەربگرێتەوە.

*** هەندێکجار ئەو تەئویلانە موقنعن، قسە لەسەر بارودۆخی خۆی دەکرێت، بە درێژایی ئەم چەند ساڵەی رابردو لە تەنگژەیەکی گەورەی ئەمنیدا بوە، قسە لە دەستوەردانی ئیقلیمی دەکرێت لەسەر مەسەلەی کەرکوک، فیعلەن دەستوەردانی ئیقلیمی زۆر هەیە، بەڕای جەنابت ئەو پاساوانەی حکومەتە یەک لەدوایەکەکانی عێراق چەندیان لە شوێنی خۆیدایە؟**

نەوشیروان مستەفا: بۆ من موقنیع نیە، ئەگینا ئەو ئیدارەیەی حکومەتی عێراقی لە ماوەی پێنج ساڵی رابردو، دەیانتوانی هەندێ ناوچە بخەنەوە سەر هەرێمی کوردستان، بۆ خۆشیان واباشتر بو بۆ نمونە، هەرێمی کوردستان هەرێمێکی جێگیرە لە روی ئەمنیەوە، لە روی ئابوریەوە، لە روی سیاسیەوە، هەر بۆ قازانجی دانیشتوانی کەرکوك‌و خانەقین‌و سنجار واباشبو کە ئەوانە لەسەر هەرێمی کوردستان بونایە، وەکو چۆن سلێمانی‌و هەولێرو دهۆك لە بارێکدا دەژین کە جۆرێك لە گەشانەوەی ئابوری تیایە، سەقامگیری تیایە، تیرۆرو دەسەڵاتی تیرۆریستەکانی تیانیە، دەکرا ئەوساکە حکومەتی هەرێمی کوردستان بتوانێ دەستەبەری ئەمن‌و ئاسایشی ئەو ناوچانەیش بکات، ئەوە لەکۆڵ حکومەتی عێراقیش دەبوەوە کە ئەوان مەجبور بن دایمەن لەشکرکێشی بکەن‌و هێز بنێرن‌و داوا لە ئەمەریکا بکەن تەدەخول بکات‌و ئەو جۆرە شتانە بکات.

*** سەبارەت بە واقیعی ئێستای کەرکوک، ئەگەر لە روی ئیداریەوە سەیری بکەین سەر بە حکومەتی مەرکەزیی فیدراڵی بەغدایە، خەڵکی زۆری کورد لەم شارەدا دەژین، لە واقعدا خۆی شارێکی کوردنشینە، ئەو جیاوازیە گەورەیە چیە ئەگەر کەرکوک لەسەر هەرێمی کوردستان بێت یان سەر بە مەرکەز بێت؟**

نەوشیروان مستەفا: یەکەمینیان ئەوەیە ئەو زوڵمە گەورەیەی لە کورد کراوە بە درێژایی چەندەها ساڵی رابردو، کورد لەوێ دەربەدەرکراوە، راونراون، زەویەکانیان داگیرکراوە، خانویان داگیرکراوە، بێبەشکراون لە ئیشوکار لەوناوچانە، کورد وەکو هاوڵاتییەکی عێراقی مافەکانی بۆ دەگەڕێتەوە، بێجگە لەوە بە راستی دەمەوێت سەرنجی خوێنەران رابکێشم بۆ ئەوەی کە بایەخی کەرکوك‌و ناوچەکانی بە تەنیا لە نەوتدا نیە، ئەگەر کەسێك نەخشەی عێراق بێنێتە بەرچاوی خۆی، ئەگەر هەرێمی کوردستان کەرکوکی لەسەر نەبێت، سلێمانی‌و هەولێر بە تایبەتی لە نێوان سنوری کەرکوك‌و سنوری ئێران وەکو سەندویجی لێبەسەردێت، یانی ئەگەر کەسێك لە هەولێرەوە ویستی هاتوچۆ بکات، بۆ بەغدا بۆ تکریت، بۆ باشوری عێراق یاخود کەسێك لە سلێمانیەوە ویستی بڕوات بۆ بەغدا بۆ تکریت بۆ باقوبە بۆ شارەکانی تری عێراق لەکوێوە هاتوچۆ دەکات یانی ئەوساکە ئەگەر بڵێین بەدەست ئیدارەیەکەوە بێت کە ئیدارەکەی رۆژێك لە رۆژان ناکۆکی هەبێت لەگەڵ هەرێمدا وەکو چۆن ئێمە زۆرجار توشی ناکۆکی دەبین لەگەڵ ئێراندا سنورمان لێدادەخەن، یان لەگەڵ تورکیا سنورمان لێدادەخەن، جاروبار لەگەڵ موسڵدا سنوردادەخەن، ئەگەر ئەوانیش سنورمان لێدابخەن خەڵکی ئەم ناوچەیە لەکوێوە هاتوچۆ بکات، مەبەستم ئەوەیە بایەخی ناوچەی کەرکوك بە تەنیا لەبەرئەوە نیە، کەرکوك شوێنێکە قوڵاییەکی ستراتیژی‌و قوڵاییەکی جوگرافیە بۆ هەمو کوردستانی عێراق، کەرکوك کوردستانی عێراق دەبەستێتەوە بە هەمو عێراقەوە، لەبەرئەوە بایەخێکی زۆر گەورەی هەیە بۆ میللەتەکەی ئێمە.

*** کاک نەوشیروان لە نەخشەی سیاسی ئێستای عێراقدا کێن ئەوانەی غەیری کورد، لەگەڵ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠دایە، لەگەڵ خوێندنەوەی ئیرادەی خەڵکی کەرکوکدایە؟**

نەوشیروان مستەفا: قسەیەکی زۆر بەناوبانگی چەرچل هەیە دەڵێت: نەدۆستی دایمی هەیە، نە دوژمنی دایمی هەیە بەڵکو بەرژەوەندی دایمی هەیە، ئەگەر ئێمە چاوێك بخشێنین بەو جۆری پەیوەندیەی جوڵانەوەی کوردو جوڵانەوە سیاسییەکانی تری عێراق لەماوەی بیست ساڵ‌و بیست‌و پێنج ساڵی رابردودا جاروبار جێگۆڕکێ کراوە، لە کۆنگرەی لەندەن‌و لەگەڵێك شوێنی تردا

کاتی خۆی کەباسی کەرکوك کراوە زۆر لەو هێزە عەرەبییانەی کەئێستا لەعێراقدا دەسەڵاتدارن‌و لەحکومەتی عێراقدا بەشدارن قبوڵیان بوە بەوەی کەرکوك وەك بەشێك لەکوردستان بگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستان‌و مەسەلەی تەعریبی تیانەمێنێ‌و کورد بەمافی خۆی بگات، بەڵام ئێستا ئەوانە دەسەڵاتدارن وەکو باسیشم کرد، هیچ میللەتێك لە دنیادا ئامادە نیە بە ئارەزوی خۆی دەست لە بستێك ئەرز هەڵبگرێت کە دەستی بەسەرداگرتوە، ئەوانەیش عەینەن بابەت، جاران کە موعارەزە بون ئەیانسەلماند بۆ کورد کە بەڵێ کەرکوك شارێکی کوردستانیە یان کوردیە یا شارێکی عێراقیە، بەڵام تابیعێکی کوردی هەیەو ئێستا بەشێك لەوانەیش پەشیمان بونەتەوە ئەگەر بە ئاشکراش پەشیمان نەبونەوە لە ڕاگەیاندنەکانی خۆیانەوە لەکاتی دەنگدان‌و موناقەشەی ناو ئەنجومەنی نوێنەران تا ئەندازەیەکی زۆر پەشیمانییان پێوەدیارە. کورد میللەتێکی دڵساف‌و تا ڕادەیەك ساویلکەیە ئەگینا ئەو کاتەی کە هێزە سیاسیەکانی عەرەب لە عێراقدا زەعیف بون دەبوایە کورد ئەو زەمانە مەرجەکانی خۆی بەسەریاندا بسەپاندایە، چونکە ڕۆژ بە ڕۆژ لەدوای ڕوخانی سەدامەوە هەندێك لەو هێزانە بەهێزتر بون لەچاو جاران، کە وەختێکیش بەهێزتر بو کەمتر داواکانی تۆ قبوڵ دەکات‌و بەدەم داواکانی تۆوە دێت.

*** دەوترێت لەکاتی ئازادکردنی عێراقدا ئەمەریکیەکان هەندێک ڕێنمای‌و مەرجیان هەبوە، ڕێگرییان لە دەسەڵاتی کوردی کردوە لەوکاتەدا ئەو هەڵوێستەی کە توانیویەتی لەخانەقیندا هەیبێت لە کەرکوک بیبێت؟**

نەوشیروان مستەفا: ئەمەریکاییەکان چیان کردوە، چەند کوردیان لەوێ کوشتوەو چەندجار کردەوەی سەربازییان کردوە، تاوەکو ئێمە ئەمەریکاییەکان تۆمەتبار بکەین؟

*** ڕەنگە سەرکردایەتی سیاسی کوردیان ئاگادار کردبێتەوە لەوەی لە سنورێکی دیاریکراودا بوەستن‌و مەیەنە ئەم شارەوە، گرەنتیەک بۆ هەرێمەکەی خۆتان؟**

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر نەیانکردایە چیان لێدەکردن؟ بەپێچەوانەوە لە ساڵانی یەکەمی دوای ڕوخانی سەدام حسێندا کورد کۆڵەکەیەکی سەرەکی بو لە پرۆسەی سیاسی لە عێراقدا، ئەمەریکا پێویستی بە کورد بو، چونکە لە عێراقدا جارێك سوننە

بەشی هەرەزۆریان دژی ئەمەریکا بون، شیعە بەشێکی زۆریان بەهۆی ئێران و بەهۆی ئەو رابردووەوە کە هەیان بو لەگەڵ ئەمەریکا لە راپەڕینی رابردودا ئەمەندە لەگەڵ ئەمەریکا کۆك نەبون، تەنیا هێزی کەرکوك بو لەگەڵ ئەمەریکاییەکاندا کورد بو، قابیلە شەڕ ئەبو لەنێوان ئەمەریکاو کوردا، رەنگە هەندێك ناکۆکی سیاسی ئەبو، لەملاوە فشار دروست دەبو، هەندێك شتی لەو بابەتانە دەبو، بەڵام بڕواناکەم ئەگەر ئێمە سور بوینایە لەسەر هەندێك هەڵوێست پێموایە دەمانتوانی بیچەسپێنین.

*** سەبارەت بە واقیعی ئێستای کەرکوك، قۆناغی ئاساییکردنەوە قۆناغی یەکەمی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ بو ، بەڕای جەنابت مەبەست لێی چەسپاندنی هەندێ مافو گەڕانەوەی ئاوارەکان بێت، ئەمڕۆ عەرەب هاواری لێهەستێت بەرامبەری؟**

نەوشیروان مستەفا: دەبێت لێرەدا دان بە راستیەکدا بنێم ئەویش ئەوەیە کە لەدوای روخانی سەدام کورد نەیتوانی نمونەیەکی باش بدات بە نەتەوەی تورکمان و نەتەوەی عەرەب لە کەرکوکدا، نمونەیەك لە حوکمڕانی باش، نمونەیەك لە رەفتاری باش لە کەرکوك لەگەڵ نەتەوە بچوکەکانی کەرکوکدا، چونکە لەدوای روخانی سەدامەوە رەنگە کورد هێزێکی گەورە بوبێت بەتایبەتی لە کەرکوکدا، حکومەتی هەرێم پشتیوانی بوە هەم قوڵاییەکی ستراتیژییان هەبوە لەوکاتەی کە بۆشاییەکی سیاسی و حکومەتی گەورە لە عێراقدا دروست بو بو، بۆشاییەکی ئەمنی دروست بو بو، کوردی کەرکوك پشتیوانێك و قوڵاییەکی ستراتیژییان هەبو کە بریتی بو لە حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئەو ئیدارەیەی کە لە کەرکوکدا دروستبو، لە راستیدا ئێمە نە لە روی ئابوریەوە نە لە روی کۆمەڵایەتیەوە، نە لە روی سیاسیەوە، نە لە روی قانونیەوە، نە لە روی ئیداریەوە نمونەیەکی ئەوەندە باشمان لە کەرکوکدا جێگیر نەکرد کە ببێتە مایەی راکێشانی سەرنجی تورکمان و عەرەب و مەسیحیەکان، هەر بۆ نمونە باسی بکەین لە شوێنێکی وەکو کەرکوکدا هەر لە سەرەتاوە لەدوای هەڵبژاردن، سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگا کوردە، پارێزگار کوردە، سەرۆکی شارەوانی کوردە، قایمقامی قەزا کوردە، بێجگە لەوەی ژمارەیەك زۆر لە سەرۆکی دەزگا پۆلیسی و ئەمنیەکان و دەزگا ئیداریەکانی تر هەموی کوردەو لەوانە بەشی تورکمانیان نەدا، من خۆم جارێکیان

لەگەڵ کابرایەکی تورکمان گفتوگۆمان بو لەسەر ئەوە وتی: ئێوە هێشتا کەرکوك نەکەوتوەتە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، بە من هیچ رەوانابینی هیچ پۆستێك لە پۆستە گرنگەکانی حکومەتم بدەیتێ، بە منی رەوانابینی لە تەندەرو قۆنتەرات و لە ژیانی ئابوریدا بمکەیت بە شەریك، بە من رەوانابینی لە دامودەزگای ئاسایش و پۆلیس و ئەوانی تر بمکەیت بە شەریك، لە هەمو دامودەزگایەکی تر، ئێستا دەسەڵاتتان لێرەنییە ئەگەر هاتمە سەر هەرێمی کوردستان ئەوسا چ گەرەنتیەك، چ زەمانێك هەیە بۆئەوەی تۆ حقوقی من بپارێزیت، پێموایە ئێمە بەداخەوە لەوەدا سەرکەوتو نەبوین، کە نمونەیەکی باشی حوکمڕانی لە کەرکوك دابمەزرێنین.

*** دەوترێت دەسەڵاتی سیاسی کورد بە راستی لە هەرێمی کوردستاندا نەیتوانیوە ئەزمونێکی زۆر باشی حوکمڕانی پێشکەش بکات بە حوکمی ئەوەی لە روی ئیداری و یاساییەوە، کەرکوك سەر بەم حکومەتە نیە تا بتوانێت بە رێساو رێنماییەکانی حوکمڕانیەکی باش پێکبهێنێت، ئەو بەرپرسیارێتیە لەسەر حکومەتی هەرێم نیە؟**

نەوشیروان مستەفا: حکومەتی هەرێم بەرپرسیارێتیەکی گەورەی لەسەرشانە، حکومەتی هەرێم دەیتوانی یەك پەروەردە دروست بکات، یەك ئاسایش دروست بکات، یەك دامودەزگا دروست بکات لە کەرکوك، بەڵام لە کەرکوك حکومەتەکەی هەولێر بۆ خۆی دامودەزگایەکی دروستکردوەو حکومەتەکەی سلێمانیش دامودەزگایەکی دروستکردوە، تەنانەت دو پەروەردە هەیە بۆ خوێندن، دو دەزگای ئاسایش هەیە، هەندێك لەو فەرمانگانە دوانەیە کە لە راستیدا ئەمە نمونەیەکی باش نییە بۆ غەیری کورد، رەنگە کورد ئەوەی قبوڵ بێت بەلایەوە شتێکی ئاسایی بێت، بەڵام بەلای کەسێکی ترەوە دەڵێت کوردەکان لەنێوان خۆیاندا رێکنەکەوتون لەسەر ئەوەی یەك دەزگای ئاسایش دروست بکەن، یەك پەروەردە دروست بکەن، یەك دادگا دروست بکەن، یەك فەرمانگە دروست بکەن، رێکناکەون لەناو خۆیاندا لەسەرئەوەی کە کێ پارێزگار بێت، کێ سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگا بێت، ئەمە نمونەیەکی باش نیە. لە کەرکوك کێبڕکێی حیزبی تا ئەندازەیەکی زۆر ئینتیباعێکی خراپی داوە بە نەتەوەکانی تر، دەبوایە لە کەرکوك هەمو حیزبەکان پێش ئەوەی کە حیزبایەتی

بکەن، جۆرێك لە مەسەلەی کوردایەتیو وەلائی نیشتمانیو جۆرێك لە بە هاوڵاتیبونی پێشکەوتوانەیان پیشانبایە نەك ئەو جۆرە وەلائە تەسکە حیزبیانەی کە بوە بەهۆی کێبرکێ لەنێوانیاندا.

*** پێتوایە لەبەر رۆشنایی دابەشبونیو عیرقیو سیاسیی لە عێراقدا کورد هەرچیەک بکات، هەرچی ئیدارەیەکی نمونەیی لە کەرکوک پێشکەش بکات بتوانێت ئینتیمای تورکمانو عەرەب رابکێشێت بەلای خۆیدا، قەت بوە لە مێژودا عەرەبەکان یان تورکمانەکان متمانە بە شۆڕشی کورد بکەن؟**

نەوشیروان مستەفا: پێموایە مومکینە، مومکین بو، لێرەش بەدواوە مومکینە، ئەگەر کورد، سەرکردایەتی کورد بتوانێت نەخشەیەکی هەمەلایەنە دابنێت لەپێش هەمو لایەنێکدا بۆ رازیکردنی کوردەکانی کەرکوك، بۆ رازیکردنی تورکمانەکان، بۆ رازیکردنی عەرەبەکان ئەگەر نەشتوانێت هەمویان رازی بکات ئەوە هەر بە شیعرو قسەی خۆش نابێت بڵێیت شاری برایەتی، بەڵکو دەبێت تۆ زەماناتی قانونیو دەستوری بدەیت بە تورکمانو بە عەرەبو مەسیحیەکان، دەبێت خزمەتگوزارییان پێشکەش بکەن، دەبێت نمونەیەکی باشیان پێشکەش بکەن، مفاوەزات لەگەڵ هێزە راستەقینەکانی عەرەبو تورکمان بکرێت، لەگەڵ ئەوانەی تا رادەیەك نوێنەرانی ویستی نەتەوەیی ئەو نەتەوانە دەکەن، وەختێك بو ئێمە خۆمان کە مامەڵەمان دەکرد لەگەڵ حکومەتی مەرکەزیدا نارەحەت دەبوین، دەبێت ئەو ئەزمونەی کە حکومەتی عێراق لەگەڵ کورددا بەکاری هێناوە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ تورکمانو عەرەبەکانو مەسیحیەکانی کەرکوکدا دوبارەی نەکەینەوە.

پێموایە ئەگەر نەخشەیەك دابنێین، ئەو نەخشەیە لایەنێکی ئابوری بێت، لایەنێکی سیاسی بێت، لایەنێکی یاسایی بێت، لایەنی جیاجیای هەبێت، لەسەر بنەمای هاوڵاتیبونی خەڵکی کەرکوك بێت، تۆ بیهێنە بەرچاوی خۆت تورکمان لە سەرتاسەری عێراقدا ژمارەیان ملیۆنێك یان کەمتر لە ملیۆنێك بن، ئایا بۆ تورکمان ئەگەر وەکو بەرژەوەندی نەتەوەیی بچکۆلە لێکیبداتەوە، قازانجی ئەو لەگەڵ چوار ملیۆن کورددایە یان لەگەڵ ٢٥ ملیۆن عەرەبدایە، بێگومان ئەگەر لەگەڵ چوار ملیۆن کورددا بێت، دەبێت بە هێزێکی گەورە دەتوانێت لە هەمو دامودەزگاکانی هەرێمی کوردستان بەشی

# ژماره ٥١٧ - ١٩-٤-٢٠٠٩

# رۆژنامەی هاوڵاتی

**نەوشیروان مستەفا:**

**گۆڕان بوە بەخواستی زۆرینەی دانیشتوانی کوردستانی عێراق**

سازدانی: هاوڵاتی

نەوشیروان مستەفا جێگری پێشوی سکرتێری یەکێتیو سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی کۆمپانیای وشە، لە چاوپێکەوتنێکدا کە هاوڵاتی لەگەڵیدا سازیداوە جەخت لەوەدەکاتەوە لیست دروستدەکەن بۆ هەڵبژاردن، بەهیواشن بگەنە دەسەڵات، بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لە سیستمی سیاسی کوردستاندا بکەن. پێشی وایە مەترسی دەرەکی لەسەر ئەزمونی کوردستان نییە.

**هاوڵاتی: ئێوە بڕیاری کۆتاییتانداوە کە لیستی سەربەخۆتان هەبێت بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکاندا؟**

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ بڕیاری کۆتاییمانداوە کە لیستمان هەبێت، دەتوانین بڵێین لیستی جیاوازمان هەبێت نەوەك لیستی سەربەخۆ، چونکە ئەوانەی بەشداری لەوەدا دەکەن جیاواز لە حیزبەکانی تری کوردستانی عێراق بەشداری دەکەن.

**هاوڵاتی: هەمو ئەوانەی بەشداری دەکەن کادرە کۆنەکانی یەکێتین،**

**یاخود خەڵکی تریش دێنە ناو لیستەکەو ئەو پرۆسەیەی ئێوەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێمە هەوڵدەدەین ئەو لیستەی دروستی دەکەین، چەند پێوەرێك رەچاو بکەین، ئەو پێوەرانە یەکەم دابەشبونی جوگرافی کوردستانی عێراقە، واتا هەوڵدەدەین نوێنەری زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی عێراقی تێدابێت، هەوڵدەدەین نوێنەری زۆربەی پیشە جیاوازەکانی کۆمەڵی کوردەواری تێدابێت، هەوڵدەدەین لەروی تەمەنەوە تەمەنی گەنجو مامناوەندیو بەئەزمونی تێدابێت، هەوڵدەدەین لەو کەسانە بن، کە جۆرێك لەئازایەتیو بەرەنگاربونەوەو بەگژداچونەوەیان تێدابێت، هەوڵدەدەین لەو کەسانە بێت کە پابەندی تەواوی پلاتفۆرمی سیاسی هەڵبژاردنەکە دەبن.

ئەگینا بەلای ئێمەوە ئەوەی کادری یەکێتی بوبێت، یاخود کادری حیزبەکانی تر بوبێت، ئەسڵەن موهیم نییە.

**هاوڵاتی: ئامانج لەم بەشداریکردنە چییە، پێتانوایە دەکرێت بەم شێوازە گۆڕان دروستبکرێت؟**

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ پێمانوایە لەقۆناغی ئێستا لە کوردستانی عێراقدا باشترین رێگا بۆ بەدیهێنانی گۆڕان رێگەی دیموکراتییە، رێگەی هەڵبژاردنو پەنابردنە بۆ سندوقی دەنگدان، زەمانی بەکارهێنانی چەكو راپەڕینی چەکدار تێپەڕیوە لە کوردستانی عێراقدا، ئەم رێگەیە بەلای ئێمەوە هێمنترینو سەلامەتترینو باشترین رێگەیە.

**هاوڵاتی: بەڵام ترسێک لەناو خەڵکدا هەیە، کە ئەم شێوازە تازەیە، ببێتە ترسێک لەسەر کۆی ئەزمونەکە، ئێوە بەمەترسی دەزانن لەسەر کۆی ئەزمونی کوردستان؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پێمانوانییە ببێتە مەترسی بۆ سەر ئەزمونەکە، بەتایبەتی ئێمە بزوتنەوەیەکی جەماوەرین، ئێمە هێزی چەکدارمان نییە، نەچەکمان هەیە نەهێزی چەکدار، حکومەتی هەرێمی کورستان بەرپرسە لە پاراستنی ئاسایشی پرۆسەی هەڵبژاردن، بەرپرسە لە پاراستنی گیانی کاندیدەکان، بەرپرسە لە پاراستنی گیانی دەنگدەرەکان، ئێمەش وەکو هاوڵاتییەك، حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێت پارێزگاری ئاسایشی ئێمەو هەمو پرۆسەکە بکات.

**هاوڵاتی: واتا گۆڕان لێرەوە دەستپێدەکات؟**
نەوشیروان مستەفا: بەڵێ گۆڕان لێرەوە دەستپێدەکات.

**هاوڵاتی: پێشتر بۆچوونێک هەبو بۆ گۆڕانکاریو چاکسازی لەناو پارتە سیاسییەکاندا بەتایبەتی پارتیو یەکێتی، تا چەند بڕواتان بەوە ماوە، پێتانوایە چاکسازی لەوێوە دەکرێت، یان بەم شێوازی ئێوە گونجاوترە؟**
نەوشیروان مستەفا: بەپێی تەجروبەی تایبەتی خۆم لەناو یەکێتیدا، ماوەی چەند ساڵێکە منیشو کۆمەڵێك لە هاوڕێکانم، هەوڵماندا چاکسازی لەناو حیزبەوە بکەین، دوای ئەوەی چاکسازی لەناو حیزبدا کرا، ئینجا چاکسازی لەناو حکومەتدا بکەین، بەتەجروبە بۆم دەرکەوت ئەوە رێگەیەکی سەرکەوتو نییە، لەبەرئەوە من وازم لەو رێگەیە هێناوە.
لەگەڵ هاوڕێکانی ترمدا هەوڵدەدەین کە چاکسازی لەڕێگەی پەرلەمانو لەڕێگەی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بکەین، نەك لەڕێگەی حیزبەوە.

**هاوڵاتی: تاچەند خۆت بڕوات بەوە هەیە ئەم گۆڕانکارییە سەرکەوتو دەبێتو ئامانجەکانی خۆی دەپێکێت؟**
نەوشیروان مستەفا: خۆم باوەڕم بەوە هەیە کە ئەمە رێگایەکی زۆر باشە بۆ گۆڕان، بۆیە بەشداری تێدا دەکەم.

**هاوڵاتی: ئەم گۆڕانکارییە تەنیا ئاراستە سیاسییەکان دەگرێتەوە، یاخود ژیانی گشتیی خەڵکیش دەگرێتەوە، چونکە خەڵک گلەیی زۆری لەئەدای حکومەتی هەرێم هەیە، ئێوە دەتوانن خەڵک لەخۆتان رازیبکەن؟**
نەوشیروان مستەفا: رەنگە لەچەند مانگی یەکەمدا نەتوانین، رەنگە لەماوەی چەند ساڵێکیشدا نەتوانیت هەمو خەڵك لەخۆت رازیبکەیت، بەڵام کاتێك تۆ بتوانیت لایەنی کەمی خزمەتگوزاریو ژیانو ئازادی بۆ خەڵك دابینبکەیت، پێموایە دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی رەزامەندی زۆرینەی خەڵك.

**هاوڵاتی: ئێستا بزوتنەوەیەک هەیە لەناو خەڵکدا، رەنگە بێسەربێت،**

**بەڵام خواستی گۆڕان‌و بەدیهێنانی چەندین داخوازی هەیە، پێتوایە بزوتنەوەکەی ئێوە هاوشانی ئەو بزوتنەوەیەی خەڵک دەبێتەوە، یاخود ئەوەی ئێوە جیاوازە؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێمە هیوامانوایە کە بتوانین خواستەکانی خەڵك لەچوارچێوەیەکدا دابڕژین، کە ببێت بەبەرنامەی داهاتوی حکومەتی هەرێمی کوردستان‌و پەرلەمانی کوردستان.

ئێمە هەوڵدەدەین شتە هاوبەشەکانی ناو هاوڵاتییانی کوردستان ئەوانەی کە ئێستا خواستی سەرەکی خەڵکە جێبەجێبکەین، بۆ نمونە یەکێك لەگەڕەکێکدا دەژی ئەو گەڕەکە بیروباوەڕی سیاسی جیاجیای تێدایە، ئەو گەڕەکە پیشەو تەمەنی جۆراوجۆری تێدایە، ڕەنگە هەندێك لەو پیشانە لەوانە بن کە تۆ بەدڵت نییە، ڕەنگە بەشێك لەو تەمەنانەی ئەو گەڕەکە یان هەندێك لەدراوسێکانی خۆتت بەدڵ نەبێت، بەڵام لەهەمانکاتدا قازانجێکی هاوبەشتان هەیە، کە بریتییە لەوەی کە شەو نوستن پێتانخۆشە ئاسایش لەگەڕەکەکەتاندا هەبێت، پێتانخۆشە ٢٤ سەعات ئاوو کارەبا هەبێت، پێتانخۆشە ڕێگەوبانی قیرتاوکراوتان هەبێت، پێتانخۆشە قوتابخانەی تەواو هەبێت تا منداڵەکان تێیدا بخوێنن، پێتانخۆشە بنکەی تەندروستی هەبێت‌و باخچە هەبێت، بۆئەوەی منداڵەکان یاریی تێدابکەن، ئەمە خەمی هاوبەشی هاوڵاتییانە ئێمە هەوڵدەدەین تەرکیز بخەینە سەر خەمی هاوبەشی ڕۆژانەی هاوڵاتییان، لەجیاتی ئەوەی هەندێك دروشمی سیاسی بەرزبکەینەوە.

**هاوڵاتی: بەبڕوای تۆ بۆ ئەم گۆڕانکارییە دەبێت لەکوێوە دەستپێبکرێت؟**

نەوشیروان مستەفا: ئەم گۆڕانکارییە لەسەرتاوە لە پەرلەمانەوە دەستپێدەکەین، ئێمە لەڕاستیدا هەرسێ دەسەڵاتی تەشریعی‌و تەنفیزی‌و قەزاییمان هەیە، بەڵام ئەم دەسەڵاتانە وەکو پێویست ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێناکەن، بۆ نمونە پەرلەمان تائێستا قانونی داناوە، بەڵام دو ئەرکی سەرەکی تر هەیە نەیتوانیوە جێبەجێی بکات، بەهۆی ئەو سیستەمەوە کە ئێستا لە کوردستاندا پەیڕەودەکرێت، ئەو دو ئەرکەش یەکێکیان ئاشکراکردنی بودجەی ساڵانەیە، داهات‌و خەرجی هەرێمی کوردستانە، دوەمیشیان لێپرسینەوەی وەزیرەکانە، بەخشین‌و لێسەندنەوەی متمانەیە بەکابینەو وەزیرەکانی، ئەگەر ئێمە بتوانین پەرلەمانێك پێکبهێنین،

کە توانای ئەوەی هەبێت متمانە ببەخشێت بەکابینەو لێیبسەنێتەوە، بەمانایەکی تر کە بتوانێت کابینە بگۆڕێتو وەزیر بگۆڕێتو لێپرسینەوە لەوەزیر بکات، لەهەمانکاتدا بتوانێت داهاتو خەرجی هەرێمی کوردستان ئاشکرابکات بۆ کۆمەڵانی خەڵك، پێمانوایە ئەمە سەرەتای گۆڕانێکی بنەڕەتی دەبێت لەژیانی سیاسی خەڵکی کوردستاندا، هاوزەمان لەگەڵ ئەمە ئێمە پێویستمان بەوە هەیە، کە دەسەڵاتی دادوەری لە کوردستاندا دەسەڵاتێکی پاك، دەسەڵاتێکی ئازا، دەسەڵاتێك بێت لەسەرو هەمو دەسەڵاتەکانی ترەوە بێت، بۆئەوەی لەحاڵەتی پێویستدا هەرکەسێك شکاتو گلەییەکی هەبو بتوانێت پەنابەرێت بۆ ئەو دەسەڵاتە دادوەرییەی کە لە کوردستاندا دروستدەکرێت، ئەمە دو ئەرکی گرنگە، سێیەمین ئەرکیان بریتی دەبێت لەوەی ئێمە بتوانین لە قۆناغی داهاتودا جۆرێك لە عەدالەتی ئیجتیماعی لەمەسەلەی دابەشکردنەوەی سەروەتو سامانی وڵاتدا، لەمەسەلەی موچەدا، لەمەسەلەی دابەشکردنی خانوو زەویو زاردا، لەمەسەلەی تەعیناتی بێ تەزکییەی حیزبی، ئەمانە هەموی کە شتی سەرەتاییو قابیلی جێبەجێکردنن.

**هاوڵاتی: واتا دەتوانین بڵێین ئەگەر ئەم بزوتنەوەیە سەربکەوێت، کۆی سیستەمەکە دەخاتەوە ژێر چاودێریو ژێر گۆڕانکارییەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ بێگومان.

**هاوڵاتی: هەڵوێستتان لەسەر ناوچە جێناکۆکەکان چۆنە، پێتانوایە بەم شێوازە دەتوانرێت ئەو ناوچانە بگەڕێنرێتەوە سەر هەرێمی کوردستان، یاخود ئێوە دەبنە بەشێک لەکێشەکان وەکو ئێستا هەیە؟**

نەوشیروان مستەفا: یەکێك لەگرفتەکانی کوردستانی عێراق ئەوەیە تائێستا داوودەزگاکان نەکراوە بەدامەزراوە، بۆ نمونە ئێمە لە کوردستانی عێراقدا تائێستا دامەزراوەیەکمان نییە، کە دابنیشێت نەخشە دابنێت بۆئەوەی ناوچە دابڕاوەکان بگەڕێتەوە بۆ سەر هەرێمی کوردستان، دامەزراوەیەکمان نییە لێپرسینەوە لەگەڵ نوێنەرەکانی کورد بکات لەبەغدا، لێیان بپرسێت بڵێ ئێوە پێنج ساڵە لەبەغدان چیتانکردوە بۆ کێشەی کورد بۆ گێڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکان.

کاتێك باس لە بەدامەزراوەییکردنی دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەین، بێگومان ئەو کاتە دەکرێت نەخشە

دابنرێت بۆئەوەی ناوچە دابڕاوەکانی عێراق، چۆن دەتوانین بهێنینەوە سەر کوردستانی عێراق، خۆم پێموایە لەڕێگەی گفتوگۆکردن لەنێوان پێکهاتەکانی ناوچە دابڕاوەکانەوە لەبەینی کوردو عەربو تورکمانو مەسیحی، لەڕێگەی گفتوگۆیەکی جدییەوە لەبەینی حکومەتی هەرێمی کوردستانو حکومەتی ناوەندیی لەبەغدا، لەو رێگایانەوە ئێمە دەتوانین چارەسەر بۆ ئەو کێشانە بدۆزینەوە.

**هاوڵاتی: پێتوایە بەشێک لەو کێشانەی کە بەوشێوەیە زەق بوەوە، هەڵەو کەموکورتی ئیدارەی کوردی بوبێت، کە وایکردبێت نەتەوەکانی تر توشی هەڵوێست وەرگرتن بوبێتن لەبەرانبەر کورددا؟**

نەوشیروان مستەفا: بێگومان، بەداخەوە ئەو ئیدارەیەی کە لەناوچە دابڕاوەکاندا لەدوای روخاندنی رژێمی بەعس دامەزرا، دەتوانین بڵێین درێژبونەوەی ئیدارەی هەرێمی کورستان بو، ئێمە نەمانتوانیوە نمونەیەکی باشو سەرکەوتو پێشکەشی دانیشتوانی ئەو ناوچانە بکەین، تەنانەت نەمانتوانیوە نمونەیەکی باش پێشکەشی کوردەکانی ئەو ناوچانە بکەین، چ جای عەرەبو تورکمان.

**هاوڵاتی: یەکێک لە گرفتەکانی ئەم وڵاتە نەبونی شەفافیەتە لەئیدارەی کوردستان، ئێوە پرۆژەتان چییە بۆئەوەی بتوانن گرەنتی بدەن بەخەڵک، کە دەتوانن دەسەڵاتێکی شەفافو کراوەبن؟**

نەوشیروان مستەفا: بێگومان مەسەلەی شەفافیەت شتێکی زۆر گرنگە، نەك تەنیا لەبواری داراییدا، ئێمە شەفافیەتمان لەبواری سیاسیشدا بەلاوە گرنگە، شەفافیەت لەبواری داراییدا ئەگەر پەرلەمانێکی دەسەڵاتدارو کارامان هەبێت، دەتوانێت وەزارەتی دارایی حکومەتی هەرێمی کوردستان ناچاربکات، کە بودجەی ساڵانە ئاشکرابکات بەو ١٧٪یەی لەبەغدا وەردەگیرێت لەگەڵ داهاتی هەرێمی کوردستاندا.

شەفافیەتی سیاسیش مەبەستمان ئەوەیە، کە پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو بەغدا، پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو ئەمەریکا، پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو دەوڵەتانی دراوسێی عێراق، ئەمەش بەرونی بۆ خەڵك ئاشکرابکرێت، کە پەیوەندییەکانی ئێمە لەسەر چ بنەمایەكو لەسەر چ پرەنسیپێكو لەسەر چ جۆرە قازانجێکی هاوبەش بنیاتنراوە، ئێمە شەفافیەتی

داراییمان بەلاوە گرنگەو شەفافیەتی سیاسیشمان بەلاوە گرنگە لەکاری حکومەتی هەرێمی کوردستاندا.

**هاوڵاتی: دەتوانین بڵێین پلانێکی تازەتان هەیە بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ لایەنە سیاسییەکان، یاخود لایەنە هەرێمایەتییەکاندا؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێمە ئەو بەرنامە سیاسییەی کە دامانناوە بۆ هەڵبژاردن، بۆچونی ئێمە روندەکاتەوە لەسەر هەمو بوارەکانی ژیان لە هەرێمی کوردستاندا، بەتەنیا بریتی نییە لەوەی کە چ جۆرە گۆڕینێکمان دەوێت لە کاروباری ناوخۆماندا، بەڵکو لەکاروباری دەرەوەشدا دەبێت بناغەیەك دابنێین، بۆئەوەی کە پەیوەندییەکانی هەرێمی کوردستان لەگەڵ دەوروبەرو لەگەڵ وڵاتانی دنیا چۆن رێکدەخرێت، ئێمە لەبەرنامەکەماندا ئەوە هەیەو لەکاتی خۆیدا بڵاویدەکەینەوە.

**هاوڵاتی: ئەو لایەنانەی شانسی ئەوەیان هەیە لە دەسەڵاتدا بن، گلەییان لە دەسەڵات هەیە کە ناحەقییان لەگەڵ دەکەن، ئێوە چ پلانێکتان هەیە بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ حیزبە سیاسییەکانی تری کوردستان؟**

نەوشیروان مستەفا: بۆ مەسەلەی حیزبە سیاسییەکانی کوردستان دەبێت بەقانونێك لە پەرلەمانی کوردستاندا رێکبخرێت، کە دەتوانین سود لەتەجروبەی میللەتانی تری دنیا وەربگرین، کە چۆن مامەڵەدەکەن لەگەڵ حیزبە سیاسییەکانی ترو ئەوانەی کە موعارەزەن لەگەڵ رێکخراوەکانی کۆمەڵگای شارستانی، ئەوە دەبێت بەقانون رێکبخرێت و لە پاشەڕۆژدا بەپرس وڕا لەگەڵ خەڵکی شارەزاو پسپۆڕ، بەرەچاوکردنی تەجروبەی بێگانە دەتوانین لەسەر ئەوە قسە بکەین.

**هاوڵاتی: بۆچی ئێوە تەرکیزتان لەسەر وشەی گۆڕانە؟**

نەوشیروان مستەفا: چونکە ئەم قۆناغەی ئێستای کوردستانی عێراق پێویستی بەگۆڕانە، پێویستی بەگۆڕانە لەپەرلەمان، لەحکومەت، لەدەسەڵاتی دادوەری، لەهەمو بوارەکانی ژیاندا، گۆڕان بەرەو چاکترکردن بەرەو باشترکردنو چاککردنی گوزەرانی خەڵك، بەرەو چاکترکردنی چۆنایەتی ژیانی خەڵك.

**هاوڵاتی: تا چەند ئامادەیی خەڵک دەبینیت بۆئەوەی بیەوێت گۆڕان**

**دروستبكات؟**

نەوشیروان مستەفا: پێموایە ئێستا گۆڕان بوە بەخواستی سەرەکیی بەشی هەرە زۆری دانیشتوانی کوردستانی عێراق.

**هاوڵاتی: پێتانوایە ئەگەر لەئەگەری سەرکەوتنی ئێوە لایەنە دەرەکییەکان کێشەتان بۆ دروستبکەن، یاخود لایەنە دەرەکییەکان دەبنە هاندەرێک، بۆئەوەی ئێوە بچنە سەر دەسەڵاتی سیاسی؟**

نەوشیروان مستەفا: لایەنی دەرەکی ئەوەی کە ئێستا لەعێراقدا نفوزی زۆری هەبێت ئەمەریکایە، ئەمەریکاش دوا هەڵبژاردنی لەسەر بنچینەی گۆڕان رویداوە، لەبەرئەوە شتێکی ئاساییە کە پێیانخۆش بێت گۆڕان لەعێراقو لەکوردستانیشدا ببێت، دەرو دراوسێکانیشمان ئەوەندە نفوزیان لەکوردستانی عێراقدا نییە تاوەکو تەگەرە دروستبکەن، پێشموانییە ئەوان دژی ئاڵوگۆڕی ناوخۆی کوردستانی عێراق بن، بەشەرتێك مەترسی بۆ سەر ئەوان دروست نەکات.

**هاوڵاتی: ترسێک کە ئەمەریکا لەگەڵ ئەوەدایە کە دەسەڵاتی هەرێم لەبەرانبەر دەسەڵاتی ناوەندا بچوک بکاتەوە، تا چەند ئەو بۆچونە بەڕاست دەزانی؟**

نەوشیروان مستەفا: پێموایە ئەوە شتێکی ناوخۆیی عێراقەو ئەمەریکا لەو مەسەلەیەدا تەدەخول ناکاتو ئەوە بەستراوە بەوەی کە تەرازوی هێز لەبەینی هەرێمو ناوەندا چۆن دەگۆڕێتو بەقازانجی چ لایەك دەگۆڕێت، ئەگینا بڕواناکەم ئەمەریکا لەو مەسەلەیەدا نە پشتیوانی لەناوەند بکات نە لەهەرێم، ئەوان دەوڵەتێکی بێگانەن.

**هاوڵاتی: پێتوایە تاچەند مەترسی هەیە لەگەڕانەوەی حکومەتی ناوەند بۆ هەرێمی کوردستان؟**

نەوشیروان مستەفا: بەبۆچونی من دەسەڵاتی ناوەندی لەعێراقدا ئێستاو تا چەندەها ساڵی تریش ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عێراق، تەنانەت داوای لێبکەیت ئەو بێت ئیدارەی کوردستانی عێراق بکات ئەو لەتوانایدا نییە، نەلەڕوی عەسکەرییەوە نە لەڕوی سیاسییەوە نە لەڕوی ئیدارییەوە نە لەڕوی ئیقتیسادییەوە، لەبەرئەوە ئەو مەترسییەی کە باسی ئەوە بکەیت جارێکی تر ناوەند هەرێم کوردستان داگیردەکات، پێموایە مەترسییەکی وەهمییەو

دروستکراوە بۆ ترساندن و تۆقاندنی خەڵك.

**هاوڵاتی: پێتوایە مەترسییەکانی سەر هەرێمی کوردستان ئێستا کەمبوەتەوە بەبەراورد بەساڵانی رابردو؟**

نەوشیروان مستەفا: بەپێی زانیاریی و هەڵسەنگاندنەی من، ئەو مەترسییە دەرەکییانەی کە لەسەر هەرێمی کوردستان، لەرۆژهەڵات و سەرەوەو خوارەوەی کوردستانی عێراق، ئەو مەترسییانەی کە لەتاران و ئەنکەرەو بەغداوە دەهات، بەڕای من ئێستا ئەو مەترسییانە وەکو جاران نەماوەو زۆر کەمبوەتەوە، دەتوانین بڵێین لەهەندێك حاڵەتدا ئەسڵەن مەترسی نەماوە.

**هاوڵاتی: لەهەڵبژاردنەکاندا، ئێوە بەهیوان کاندیدەکانتان لە چ جۆرە خەڵکێک بن، خەڵکانێکی کۆنە سیاسی بن، یاخود تەکنۆکرات، یاخود خەڵکانێک بن کە دڵسۆزو تا رادەیەک ناسراوی ناوچە جیاوازەکانی کوردستان بن؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێمە دەبێت کۆمەڵێك شت لەبەرچاو بگرین، یەکێکیان دابەشبونی جوگرافییە کە دەبێت نوێنەری هەمو ناوچەکانی تێدابێت، ئەوی تریان پیشەیە، بەواتایەکی تر دەبێت لەناو ئەو گروپە پزیشك و ئەندازیارو پارێزەرو مامۆستاو جوتیارو کرێکارو هونەرمەندو رۆژنامەنوس و ئەوانەی تێدابێت، لەهەموشی گرنگتر ئەوەیە کە دەبێت رابردوی پاك بێت، لەناو خەڵکدا کەسێکی خۆش ناو بێت، لەو کەسانەبێت کە ئازایەتی ئەوەی تێدابێت لەپەرلەماندا قسەبکات، لەحاڵەتی پێویستدا هەڵبـاتـێ، بەرگری لەمافی خەڵك بکات، خەمەکانی خەڵك بباتەوە ناو پەرلەمانەوە، لەسەر ئەرکەکانی پەرلەمان و لەسەر ئەو پلاتفۆرمەی کە خەڵك متمانەی پێدەبەخشێت، پابەندی بێت و لەسەری سور بێت و لێی پەشیمان نەبێتەوە، نە بەهەڕەشەو نە بەدەستکەوتی مادیی و ئیمتیازات، پێموایە لەم قۆناغەی پەرلەماندا ئەوانە زەرورین، بەڵام تەکنۆکرات رەنگە زۆرتر زەروری بێت بۆ دامودەزگای کارگێڕی و بەڕێوبەرایەتی حکومەت، نەك بۆ ناو پەرلەمان.

**هاوڵاتی: بەبڕوای تۆ، ببنە هێزێکی دەرکەوتو کاریگەریتان هەبێت لەسەر ئاڵوگۆڕەکان، تا چەند چانسی ئەوەتان هەیە بگەنە دەسەڵاتی سیاسی؟**

نەوشیروان مستەفا: لەراستییدا من ناتوانم پێشبینی ئەوە بکەم، تائێستاش لەکوردستاندا نەریتی راپرسی سەرتاسەری بەشێوەیەکی بێلایەن نییە، کە بتوانین لەسەر ئەوە قسەبکەیت، دەبێت چاوەڕێ بین‌و بزانین ئەنجامی هەڵبژاردنەکان چۆن دەبێت.

**هاوڵاتی: ئەگەر نەتانبردەوە، بەهیوان ببن بەئۆپۆزسیۆن یاخود هەروەکو کۆمپانیای وشە دەمێننەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: ئەمەی ئێمە پەیوەندی بەکۆمپانیای وشەوە نییە، کۆمپانیای وشە وەکو دەزگایەکی راگەیاندن پێش هەڵبژاردن‌و دوای هەڵبژاردنیش وەکو دەزگایەکی راگەیاندنی بێلایەن‌و سەربەخۆ دەمێنێتەوە، ئێمە کاردەکەین بۆئەوەی کە زۆرایەتییەکی وا بەدەستبهێنین بتوانین دەسەڵات بگرینە دەست، بۆئەوەی ئەو بۆچونانەی کە هەمانە لەڕێگەی حکومەتەوە بکەین، ئەوە خیاری یەکەمی ئێمە، ئەگەر ئەوە نەبو، خیاری دوەم بێگومان ئێمە دەبینە ئۆپۆزسیۆنێکی کارا لەناو پەرلەمانی کوردستاندا، دەمانەوێت ببێتە دەستپێکردنی سەرەتای ژیانێکی دیموکراسی، چونکە لەهیچ شوێنێکی دنیا ناتوانیت بڵێی دیموکراسی هەیە، ئەگەر دەسەڵات‌و ئۆپۆزسیۆن پێکەوە نەبێت، لەوڵاتێکدا ئەگەر ئۆپۆزسیۆن نەبێت واتا دیموکراسیەتی تێدا نییە.

**هاوڵاتی: ئەگەر ئێوە چەند کورسییەکتان هێناو حیزبەکانی تریش، کە جیاوازن لەپارتی‌و یەکێتی چەند کورسییەکیان هێنا، تاچەند ئەگەری ئەوە هەیە ئێوە تەحالوفات دروستبکەن لەپەرلەماندا؟**

نەوشیروان مستەفا: ئەوە هەڵدەگرین بۆ دوای هەڵبژاردن، لەسەر شتی هاوبەش هەمیشە دەتوانین ئێمە هاوکاری‌و هاوپەیمانی بکەین.

**هاوڵاتی: وەکو ئەگەرێک، ئەگەر ئێوە چانسی ئەوەتان هەبو زۆرترین کورسی بەدەستبهێنن، بەڵام پارتی‌و یەکێتی ئامادەنەبون تەسلیم بەئیرادەی سندوقەکانی دەنگدان بن؟**

نەوشیروان مستەفا: هیوادارم شتی وا رونەدات.

۲۰۰۹-۵-۱۵

# گۆڤاری لڤین

**نەوشیروان مستەفا:**
**ئەگەر خەڵكانێک بیانەوێت بۆ مەبەستی سیاسی گۆڕی رابوردو هەڵبدەنەوە، ئێمە لە رابوردوی خۆمان ناترسین، لەبەرئەوەی هیچ شتێكمان نییە**

لڤین: گفتوگۆی ئەحمەد میرەو هێمن باقر

بە شۆفێری ئەو تەكسییەمان وت كە بردینی بۆ گردەكە: ئەگەر تۆ نەوشیروان مستەفا ببینیت، چ پرسیارێكی لێدەكەیت؟ وتی: پێیدەڵێم چۆن و بەچی ئەم بارودۆخە دەگۆڕیت؟

نەوشیروان مستەفا ئەمین جێگری پێشوی تاڵەبانیو سەرۆكی لیستی (گـۆڕان)ی ركەبەری سەرەكیی تاڵەبانیو بارزانـی، لە دیدارێكی گۆڤاری (لڤین)دا لەسەر هەڵبژاردنەكانی كوردستان و بەرنامەی قەوارەكەی و هەڵمەتی راگەیاندن لە هەڵبژاردنەكاندا دەدوێت.

ئەو دوای نائومێدبونێكی زۆر لە تاڵەبانیو حیزبەكەی، هاتە دەرەوەو كۆمپانیای (وشـە)ی دامـەزراندو دواتریش دەستی بە بڵاوكردنەوەی راوبۆچونەكانی خۆی كرد دەربارەی سیستەمی سیاسی لە كوردستاندا، ئەمەشی كردە بناغەی دروستكردنی لیستی

(گۆڕان).

نەوشیروان بە حەزەرێکی زۆرەوە مامەڵەدەکات، ئێستا نەوشیروان مستەفا لە هیچ کاتێکی تر ناچێت، ئەو هەم سلّدەکاتەوە هەم شادمانە. سلّدەکاتەوە لەوەی کە ڕێگرییەکان بواری ئەوەی نەدەنێ خەونەکانی بکاتە حەقیقەت و شادمانیشە بەوەی کە تێکڕای شەقامی ناڕازیی کوردی چاویان لە ئەوەو ئومێدی گۆڕانیان پێوە بەستوەتەوە.

نەوشیروان مستەفا دەیەوێت بەوە بە هەموان بڵێت ئەو ئێستا جیاوازتر لە جاران بیردەکاتەوەو جیاوازتریش کاردەکات.

هەر لەبەر ئەم هۆیەشە، هەموان چاویان لەو پیاوەیە کە ساڵانێکی زۆر جێگری تاڵەبانیی ڕکابەری بوەو ئێستاش دەیەوێت لە هەڵبژاردنەکاندا شوێن بە زۆر سیاسی لەقبکات.

**لڤین: لیستەکەی ئێوە ناوی گۆڕانەو دروشمەکەشتان گۆڕانکارییە، بە بڕوای تۆ ئەم بارودۆخە دەتوانرێت بگۆڕێت، بەو مانایەی گۆڕان تەنیا بە دروشم و پڕوپاگەندەی هەڵبژاردنە یان خەونێکە دەتوانرێت بهێنرێتە دی؟**

نەوشیروان مستەفا: لەم قۆناغەی ئێستای هەرێمی کوردستاندا، باشترین هەلومەرج ڕەخساوە بۆ ئەوەی گۆڕانێکی بنەڕەتی بکرێت. ئێمە کە باسی گۆڕان دەکەین، مەبەستمان ئینقیلابی عەسکەری نییە. کە باسی گۆڕان دەکەین، مەبەستمان ڕوخاندن نییە. مەبەستمان ئەوە نییە ترس لەسەر هەرێمی کوردستان دروست بکرێت، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە مۆدێلێکی سیاسی لە کوردستان هەیە، ئەو مۆدێلە پێویستی بە گۆڕانکاری هەیە.

ڕەنگە (٥) ساڵ لەمەوپێش، ئەو مۆدیلە زۆر لەبارو گونجاو بوبێت. (١٠) ساڵ لەمەو پێش، گونجاو لەبار بوبێت، تەنانەت تا ١٥ ساڵ لەمەوپێش ڕەنگە پێویست بە گۆڕانی ئەو سیستەمە نەکرابێت، بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتوە کە ئەو سیستەمە سیاسییەی لە کوردستانی عێراقدا حوکم دەکات، جۆرێک لە گۆڕانی بەسەربێت کە بشوبهێت بە سیستەمە سیاسییەکانی دونیا، نەک سیستەمە تۆتالیتارەکانی دنیا. ئەو سیستەمەی ئێستا کە ئێمە هەمانە، ئێمە لە کوردستانی عێراقدا پەرلەمانمان هەیە، دەسەڵاتی جێبەجێکردنی هەیەو دەسەڵاتی دادوەریمان هەیە. بەڵام لە سەرو ئەوانەوە سەرکردایەتیی سیاسیمان هەیە. بۆ نمونە: لە

هەڵبژاردنی ئەم جارەدا، کێ بڕیاریدا کە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان بە لیستی داخراو بێت؟ مەکتەبی سیاسی بڕیاریدا نەک پەرلەمان. کێ بڕیاریدا جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بگۆڕێت؟ لە مەکتەبی سیاسی بڕیاری لەسەر درا، نەک ئەوەی کە پەرلەمان یەکێک بانگبکات و متمانەی لێبسێنێتەوەو یەکێکی دیکە بانگبکات و متمانەی پێببەخشێت. ئێستا کاتی ئەوە هاتوە کە ئەو کارە بکەین. ڕەنگە جاران بونی ئەو سەرکردایەتییە سیاسییە لەبەر بونی ئاسایشی نەتەوەیی زەرور بوبێت، بەڵام لە قۆناغی ئێستادا بەرەو ئەوە دەڕۆین، کە هەمو چوارچێوەیەکی سیاسیو یاساییو دەستوری و ئابوری جێگیربوە. لەبەرئەوە ئیتر پێویستە ناوماڵی خۆمان ڕێکبخەینەوە، ڕێکخستنەوەی ناو ماڵی خۆمان بە مانای ئەوە نییە، کە کەس زەرەری لێبکات، بەڵکو بە مانای ئەوەی کە دەستکاریی شێوەی حکومڕانیی سیاسیی وڵاتەکەمان بکەین. ئەویش ئەوەیە ئیتر ئێمە وڵاتەکەمان بەرەو ئەوە بەرین، کە دەسەڵاتی مەکتەبی سیاسی بەسەر ئەنجومەنی وەزیرانو دەسەڵاتی داوەرییەوە نەمێنێت.

**لڤین: باست لەوە کرد کە گۆڕان لای ئێوە پرۆژەیە، ئایا نەخشەیەکتان بۆ ئەم گۆڕانکارییە هەیە، ڕونتر بڵێین: ئەو جومگانەی کۆمەڵگا کامانەن کە بە بڕوای ئێوە پێویستیان بە گۆڕان هەیە؟**

نەوشیروان مستەفا: لە سەرو هەمو شتێکەوە، گۆڕان لەوەی کە دەستوەردانی حیزب نەبێت. بە مانایەکی تر، جیاکردنەوەی حیزب لە حکومەت، دەستتێوەردانی حیزب لە کاروباری پەرلەمان، ئەنجومەنی وەزیران، لە کاروباری دەسەڵاتی داوەری، دەستتێوەردانی حیزب لە زانکۆکان، دەستتێوەردانی حیزبە لە بازاڕ. ئەمانە ئەو شتانەن کە دەبێت سنورێکیان بۆ دابنرێت. هەمو دەزگایەک لەو دەزگایانەی ئێمە هەمانە لە کوردستاندا، دەبێت ئەرکەکانی خۆی وەکو ئەوەی لە یاسای دەستوریدا باسکراوەو لە هەمو دنیادا باوە، جێبەجێ بکات.

**لڤین: ئەمانە هەمو ئەو قسانەن کە تالەبانیو بارزانییش دەیانکەن، بەڵام ئەمە چۆن دەچنە بواری جێبەجێکردنەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: پێموایە قسەکەی من تازەیە.

لڤین: بۆ نمونە: مام جەلال پرۆژەیەکی هەیە بۆ جیاکردنەوەی حیزب لە حکومەت، کاک مەسعودیش لە چەند بۆنەیەکدا باسی ئەوەی کردوە کە دەبێت دەستتێوەردان لە حکومەتدا نەبێت و سەربەخۆیی دادگاکان پارێزراو بێت. بەڵام لەسەر ئاستی واقیعی ئێمە هیچ کام لەمانە نەبینراون. پرسیاری خەڵک ئەوەیە کە ئەم بانگەشانە چۆن چۆنی دەچنە بواری جێبەجێکردنەوە، ئێوە چ میکانیزمێکی کردەییتان بۆ ئەم کارە هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: من نازانم تا چەند نوسینەکانو بەرنامەکانی ئێمەت خوێندوەتەوە. ئەو مەسەلەیەی کە ئێمە باسیدەکەین، کە حیزب لە حکومەت جیابکرێتەوە. بەو رۆشنییەی کە ئێمە ئاماژەمان پێکردوە، کەسی دیکە باسینەکردوە. هیچ لایەنێکی سیاسی باسینەکردوە، وەختێک ئێمە باسی ئەوە دەکەین کە پەرلەمان خاوەن دەسەڵات بێت، لەوەی سێ ئەرکی سەرەکیی هەیە جێبەجێبکات؛ یەکێکیان یاسادانانە، کە ئێستا دەیکات. دو، ئەرکی تری ماون کە جێبەجێینەکردون، یەکێکیان ئەوەیە کە هەمیشە لە پەرلەمان هەمو جێگەکانی دنیا ئەوانن کە متمانە بە وەزیرەکان دەبەخشنو متمانەیان لێدەسێننەوە. دەتوانن وەزیرەکان بۆ لێپرسینەوە بانگبکەن. لە کاتێکدا ئەرکەکانی جێبەجێنەکات متمانەی لێبسێنێتەوە، ئەمە یەکێکە لەو ئەرکانەی کە پەرلەمانەکەی ئێمە نەیتوانیوە بەتەواوی جێبەجێبکات. ئەرکێکی دیکە ئەوەیە کە دەبێت ساڵانە داهات و خەرجیی حکومەت بەوردی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکاتو بزانێت داهات چەندە؟ خەرج چەندە؟ چۆن خەرجکراوە؟ دەسەڵاتی ئەوەی هەبێت لە کەرتێکەوە بگوێزێتەوە بۆ کەرتێکی تر. پەرلەمان ئەم ئەرکەشی جێبەجێنەکردوە.

هەروەها دەسەڵاتی دادوەریمان هەیە، بەتەنیشت دەسەڵاتی دادوەرییەوە مەکتەبی کاروباری کۆمەڵایەتیی حیزبەکان هەیە، کە ئەوانیش کاروباری دادگا جێبەجێدەکەن. ئەمە پێویستی بەوەیە کە لە پەرلەماندا یاسا دەربکرێت کە کاروباری دادگا تەنیا دادگا بتوانێت بیبینێت، نەک لە تەنیشت ئەوانەوە دەسەڵاتێکی دیکەش هەبێت هەمان دەسەڵاتی دادگای هەبێت. ئەو شتانەی کە باسمان کردوە، پێموایە هەر ئێمە باسمانکردون، ئەوانی دیکە لەوانەیە وەکو دروشم باسیانکردبێت، بەڵام وردەکارییەکانیان باسنەکردون.

لڤین: واتە دەتانەوێت لە ڕێگەی پەرلەمانەوە ئەو کارە بکەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ دەمانەوێت لە ڕێگەی پەرلەمانەوە ئەو کارە بکەین.

**لڤین: بەڵام خەڵکی دەڵێن بەشێک لە ئەندامانی پەرلەمان کە لەسەر لیستی یەکێتین، کەسی نزیکی نەوشیروان مستەفان‌و خۆی داینا‌ون، ئەگەر نەوشیروان مستەفا دەتوانێت ئەم کارە بە پەرلەمان بکات، بۆچی تا ئێستا ئەم کارەی نەکردوە؟**

نەوشیروان مستەفا: دەگەڕێینەوە بۆ ئەوەی کەموکوڕی لە سیستەمی سیاسیی وڵاتەکەماندا هەیە. مەسەلە ئەوە نییە کەموکوڕی لە ئەندامانی پەرلەماندا هەیە، زۆرێک لە ئەندامانی پەرلەمان خەڵکی بەتواناو لێوەشاوەن، پاشان هەرچەندە من پەشیمانیش نیم کە بەشێک لە ئەوان من دامنابن. یاخود بە ئیمزای من بوبن بە ئەندامی پەرلەمان. ئەوانە هەمویان مرۆڤی دڵسۆزو نیشتیمانپەروەرن، کەموکوڕی لە سیستەمی وڵاتەکەی ئێمەدایە کە لە سەرو ئەوانەوە شتێک هەیە پێیدەوترێت سەرکردایەتیی سیاسی یان مەکتەبی سیاسی، دوا بڕیار بەدەست ئەوانە، بەدەست پەرلەمان نییە، کە پێویست بو بەدەست ئەوان بێت.

**لڤین: هەندێک دەڵێن نەوشیروان مستەفا جێگری مام جەلال بوە، جێگری سکرتێری یەکێتی بوە، ئەو کاتەی کە لە یەکێتیدا بو بۆ ئەم کارانەی نەکردوە، کە ڕەنگە لەو پۆستەدا بیتوانیایە بیانکات؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێستا دو جێگری هەیە، دەتوانیت بڕۆی پرسیار لە جێگرەکانی بکەیت، کە دەسەڵاتیان چەندە؟

**لڤین: هەندێک پێیانوایە لەدوای ئەوەی کە نەتانتوانی لە ڕێگەی هەڵبژاردنە ناوخۆییەکانی یەکێتییەوە دەست بەسەر یەکێتیدا بگرن، ئێستا دەتانەوێت یەکێتی لاوازبکەن. دروستکردنی ئەم لیستەش بە بەشێک لەو کارە دەزانن؟**

نەوشیروان مستەفا: ئەوە بۆچونێکی چەوتە، ئێمە بەنیاز نیین دەست بەسەر یەکێتیدا بگرین، ئێمە دەمانەوێت گۆڕانکاری لە هەمو وەزعی سیاسیی هەرێمی کوردستاندا بکەین. گۆڕانکاری لە پەرلەمان‌و دەسەڵاتی جێبەجێکردندا بکەین. بەپێچەوانەوە،

هەبونی چەند لیستێکی جیاواز لە ململانێی سیاسی لەگەڵ یەکتری، بیروبۆچونی جیاواز لەناو پەرلەماندا دەهێنێتەپێشەوە. ڕەنگە ئەوە یارمەتیدەر بێت بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بە خۆیاندا بچنەوە. ئێمە نە داوامان لە کەس کردوە حیزبەکە پارچەپارچەبکات، نە داوامان لە کەس کردوە بکشێتەوە. نە بە تەمای ئەوە بوین شتێکی لێبکەین. منیش‌و هاوڕێکانیشم ماوەیەکی زۆر پێمانوابو لە ڕێگەی ریفۆرمی ناو حیزبەوە، دەتوانین کاریگەریمان لەسەر ئەوە هەبێت کە بتوانین چاکسازی لە بارودۆخی گشتیی کوردستاندا بکەین. دوایی بە کردەوە بۆماندەرکەوت کە چاکسازی لە ناو حیزبدا ناکرێت، بەڵکو لە دەرەوەی حیزب دەکرێت بە پشتبەستن بە خەڵکی ناحیزبی‌و ئەو کەسانەی کە لە بنکەی حیزبەکاندا قازانجیان لە گۆڕیندایە.

**لڤین: هەندێک دەڵێن کێشەی نەوشیروان مستەفا لە یەکێتیدا کێشەی دەسەڵات‌و کێشەی پارە بوە؟**

نەوشیروان مستەفا: بە شێوەیەکی گشتی هەمو کێشەکان لە کوردستان کێشەی دەسەڵات‌و پارەن. کێشەی دەسەڵاتە بۆ ئەوەی دەسەڵاتێکی یاسایی کە عەدالەتی کۆمەڵایەتی جێبەجێبکات، بێتە کایەوە. کێشەی پارەشە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی عەدالەت بەسەر خەڵکدا دابەشبکرێت. بۆ ئەوەی نە دەسەڵاتەکە خراپ بەکاربهێنرێت، نە پارەکە خراپ بەکاربهێنرێت. بە بۆچونی ئێمە، تا ئێستا دەسەڵاتەکەش خراپ بەکاردەهێنرێت‌و پارەکەش خراپ بەکاردەهێنرێت. ئێمە لایەنگری ئەوەین کە پارەو دەسەڵات بە قازانجی خەڵک‌و عەدالەتی کۆمەڵایەتی بەکاربهێنرێت.

**لڤین، لەناو یەکێتیدا دەسەڵات‌و پارە لە دەستی تۆدا لە چ ئاستێکدا بون؟**

نەوشیروان مستەفا: لەناو یەکێتیدا نەک من، ڕەنگە برادەری تریش دەسەڵاتی ئەوەی هەبوبێت، زەوی دابەشبکات، پارە بەسەر خەڵکدا دابەشبکات، پلەوپایە ببەخشێتەوە. بەڵام لەناو مەکتەبی سیاسیدا هەمیشە کەسی یەکەم بڕیاری سیاسیی بەدەست بوە.

**لڤین: تۆ هەرگیز کێشەی ئەوەت هەبوە داوای ئەوە بکەیت ببیتە سەرۆکی حکومەت یان سەرۆکی پەرلەمان‌و ڕێگری کرابێت؟**

نەوشیروان مستەفا: من خۆم نەمویستوە، بەڵام دەمتوانی ببم.

**لڤین: لە مانگی رابوردودا کاتێک ناوی لیستەکەتان لە کۆمیسیۆن تۆمارکرد، لەلایەن راگەیاندنی پارتیو یەکێتییەوە هێرشێکی توند کرایە سەرتان، پێتانوایە ئەو هەڵمەتەی کە کرایە سەر خۆتانو لیستەکەتان، هۆکارەکەی بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: پێموایە لە کۆمەڵێکی وەکو کۆمەڵی کوردیدا، ئەوانە شتی نائاساییین. ئەگینا لە وڵاتە دیموکراتەکاندا، ئەو هێرشی راگەیاندنە لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا، شتیکی ئاساییە. لە کوردستانیشدا ئەگەر هێزی چەکداری بێلایەن بوایەو موڵکی حکومەت بوایە، نەک لەژێر دەستی حیزبدا بوایە، زۆر شتێکی ئاسایی بو، بەڵام لەبەرئەوەی لەلای ئێمە هێزی چەکدار بێلایەن نییە. بۆیە شتێکی ئاسایی نییە.

**لڤین: پێتوایە لە هەڵبژاردنەکاندا هێزی چەکداری کوردستان بێتە ناوەوەو لایەنگری لیستێک لە لیستەکان بکات؟**

نەوشیروان مستەفا: هیوادارم شتی وا نەبێت.

**لڤین: نەیارەکانت دەڵێن نەوشیروان مستەفا هەمیشە لە ململانێکاندا نەفەسی کورت بوە. بۆ نمونە: لە دانوستاندنەکاندا، لە شەڕەکاندا، باس لەوە دەکەن کە لە ململانێدا زو بێزار دەبێتو وازدەهێنێت، ئایا ئەم جارە بەئاسانی گۆڕەپانەکە بەجێدەهێڵێت؟**

نەوشیروان مستەفا: من لە کاتی پێشمەرگایەتیدا (١٥) ساڵ لە شاخ بوم. لەدوای راپەڕین کاتێک هاتوەتە سەر دابەشکردنی دەستکەوتو پلەوپایە. لەو کاتەداو لە کاتی شەڕی ناوخۆدا، من بۆم بەجێهێشتون. پێشموایە ئەو کارەم جێگەی سەربەرزییە. بەجێهێشتنی مەیدانەکە لەبەر نەفەسکورتی نەبو، لەبەر ناڕەزایەتی بو. لەبەرئەوە هەندێک جار لەبەر ناڕەزایەتی بوە کە بەجێمهێشتوە. نەمویستوە ململانێبکەم، نەمویستوە پێکدادانی چەکداری بکەم.

لە هەمو زەمەنێکدا شتی یەکەم هەیەو ئەولەویات هەیە. لە سەردەمێکدا پارێزگاری لە یەکێتی، ئەولەویەتی هەبوە. لە سەردەمێکی دیکەدا، پارێزگاریکردنی هەرێمی کوردستان ئەولەویەتی هەبو. لەبەرئەوە چاوپۆشیمان لە زۆر شت کردوەو

پێمان لە زۆر شت ناوە. وازمان لە زۆر شت هێناوە، لە سەردەمێکدا لەپێناوی قەوارەی یەکێتیی نیشتیمانیو لە سەردەمێکی دیکەدا، لەپێناوی قەوارەی گەلی کوردستاندا. بۆ خۆشبەختیی ئەو دو قەوارەیە ئێستا هیچ مەترسییەکیان لەسەر نەماوە، بۆیە دەتوانم ئێستا بە ئازادی جوڵەبکەم.

**لڤین: پێتوایە لە ئێستادا مەترسی لەسەر هەرێم نەماوە؟ ئەی مەترسیی دەرەکی؟**

نەوشیروان مستەفا: وەکو جاران نییە. گرنگترین شت بۆ ئەوەی کە بتوانیت بەرەو روی مەترسیی دەرەکی ببیتەوە، ئەوەیە کە جەبهەی ناوخۆیی خۆت بەهێز بێت. دەبێت متمانە بگێڕینەوە بۆ نێوان خەڵکو حکومەت. خەڵک حکومەت بە هی خۆی بزانێتو حکومەتەکەش جێگەی متمانەو باوەڕی خەڵک بێت. ئەگەر جەبهەی ناوخۆیی بەهێز بو، ئەو کاتە ئەگەر مەترسی لە دەرەوەش هەبو، من پێموایە ئەسڵەن ئەهمیەتی نییە. بۆ نمونە: دەوڵەتێکی وەکو ئەمەریکا هەمیشە دەڵێت مەترسیی دەرەکیم لەسەرە. روسیا دەڵێت مەترسیی دەرەکیم لەسەرە. هەمیشە کە وەختێک تیۆری ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان دادەنێن، لەسەر بنەمای مەترسیی دەرەکیو ناوەکی دایدەڕێژن. دەوڵەتێک هەرچەندە بەهێزیش بێت، خۆی بە بێبەش نازانێت لەوەی کە مەترسیی دەرەکیی لەسەر بێت. دەبێت گومان بکات کە مەترسیی دەرەکیی لەسەرە، بەڵام شێوازەکانی گۆڕاون لەگەڵ (١٠) ساڵ لەمەوپێشدا.

**لڤین: رات چییە لەسەر متمانەی نێوان خەڵکو دەسەڵات؟**

نەوشیروان مستەفا: پێموایە متمانە لەنێوانیاندا نەماوە. دەلاقە کەوتوەتە نێوانیانەوە.

**لڤین: دوایەمین نوسینی خۆت پێشکەشی ئەوانە کردوە کە تۆ بە ئەندازیاری شەڕی ناوخۆ دەزانن، لێکدانەوەی تۆ چییە بۆ ئەم بابەتە؟ بۆچی هەندێک دەیانەوێت تۆ وەکو ئەندازیاری شەڕی ناوخۆ بناسێنن؟**

نەوشیروان مستەفا: ئەوانە دو جۆرن؛ جۆرێکیان بڕیارێکی پێشوەختیان داوە دوژمنایەتیی من بکەن. کاری باش بکەمو کاری خراپ بکەم، ئەوان لە قەناعەتی خۆیاندا ئەو بڕیارەیان داوە. من ناتوانم قەناعەتی ئەوان بگۆڕم. بەڵام توێژێکی دیکەش لەناو

خەڵکدا هەیە، کە کەوتونەتە ژێر پڕوپاگەندەی نەیارەکانەوە. بۆ نمونە: کە باسی ئەوە دەکەن کە ئەندازیاری شەڕی ناوخۆیە، هەندێک کەس هەیە ئاگاداری روداوەکان نییە، رەنگە بڕوابکات. من بۆیە ئەو یادداشتانەم بڵاوکردەوە کە دوای خوێندنەوەی خوێنەران خۆیان داوەری بکەن. کەسێکی بێلایەن بتوانێت دادوەری بکات، ئایا بەڕاستی وەکو نەیارەکانی من دەڵێن، من ئەندازیاری شەڕی ناخۆ بوم یان ئەندازیار نەبوم؟!

**لڤین: بە بڕوای تۆ بەکارهێنانی ئەم کارتە (واتە کارتی شەڕی ناوخۆ)، کارتێکی بێبەهایە لە هەڵبژاردندا؟**

نەوشیروان مستەفا: من تەمەنای ئەوەم دەکرد ئێستا گفتوگۆ لەسەر سبەینێو دو سبەی بکەین، نەک گفتوگۆ لەسەر پێرێو بەسرپێرێ. من خۆم لایەنگری ئەوە بوم گۆڕی رابردو هەڵنەدەینەوە، بەڵام کاتێک کە خەڵکی تر بۆ مەبەستێکی دیاریکراو بۆ مەبەستێکی سیاسی بیانەوێت رابوردو هەڵبدەنەوە، ئێمە لە رابوردوی خۆمان ناترسین. لەبەرئەوەی هیچ شتێکمان نییە.

**لڤین: بەپێی یەکێک لەو بەڵگەنامانەی لەبەردەستی (لڤین)دان، کە فاکسێکی تۆیەو لە ئێرلەنداوە بۆ مەکتەبی سیاسیت ناردوە، لەدوای رێککەوتنی دبلنی نێوان یەکێتیو پارتی. بەئاشکرا وتوتە کە جارێکی دیکە بەشداریی دانوستاندن لەگەڵ یەکێتیو پارتی ناکەیت. ئایا ئەمە مانای ئەوە ناگەیێنێت کە تۆ دانوستاندنت رەتکردوەتەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: هێشتا ئەو بەشەم لە یاداشتەکان بڵاونەکردوەتەوە، ئەو کاتەی کە ئەو بەشەم بڵاوکردەوە، دەتوانیت ئەو پرسیارەم لێبکەیت.

**لڤین: هۆکار چییە کە لە بڵاوکردنەوەی یاداشتەکانت وەستایت؟**

نەوشیروان مستەفا: بۆ ئەوەی گرژیی زیاتر نەبێت، وەستاندمن.

**لڤین: دوای دروستکردنی لیستەکەت، پەیوەندیی خۆت لەگەڵ یەکێتی لە چ ئاستیکدایە؟**

نەوشیروان مستەفا: لەسەر ئاستی شەخسی پەیوەندییەکانم ئاساییە، چونکە من ساڵانێکی دورودرێژە لەگەڵ هەمو ئەوانەدا هاوڕێو هاوسەنگەر بومو پێکەوە کارمانکردوە. ئێستا بۆچونی

سیاسیمان جیاوازە، ئەگینا هیچ کێشەیەکی ترمان نییە، بەڵام بەداخەوە کە لە رۆژنامەکاندا هەندێک جار هێرش و شتی وا دەکرێت، من پێموایە جۆرێک لە بێویژدانی هەیە.

**لڤین: چ رێوشوێنێک دەگریتەبەر بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردنەکاندا دەستتێوەردانی سەربازی رونەدات؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پەنادەبەینەبەر دادگا، پەنادەبەینەبەر یاسا. ئەگەر پێویستیشی کرد، پەنا دەبەینەبەر دەسەڵاتی دادوەریی بەغدا. ئێمە بەهیچ جۆرێک باوەڕمان بەوە نەماوە کە چەک و توندوتیژی بەکاربهێنرێت، پێمانوایە پاراستنی ئاسایشی پرۆسەی هەڵبژاردن لە سەرەتاوە تا کۆتایی، لەئەستۆی حکومەتی هەرێمی کوردستاندایە.

**لڤین: پێشبیندەکەیت لە هەڵبژاردندا هیچ گرژی و کارێکی نائاسایی روبدات؟**

نەوشیروان مستەفا: هیوادارم بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێوەبچێت.

**لڤین: بە تێڕوانینی تۆ رکابەریی نێوان لیستەکانی هەڵبژاردن چۆن دەبێت؟**

نەوشیروان مستەفا: دەبێت چاوەڕێبکەین، ئومێدم وایە بەسەرکەوتویی کۆتاییبێت.

**لڤین: چ جیاوازییەک لەنێوان ئەم هەڵبژاردنەو هەڵبژاردنەکانی پێشودا دەبینیت؟**

نەوشیروان مستەفا: قۆناغەکە گۆڕاوە، لە قۆناغەکانی پێشودا سەردەمێک ئەولەویەت بە پارێزگاریکردنی قەوارەی حیزب دەدرا، سەردەمێکی تر بۆ پارێزگاریکردن لە قەوارەی هەرێم بو، ئێستا قەوارەی حیزب و هەرێم پارێزراوە. ململانێیەکی سیاسی لەنێوان بۆچونی سیاسیی جیاواز لەسەر جۆری بەڕێوەبردنی حکومەت و لەسەر ئیدارەی دەوڵەت هەیە.

**لڤین: بەنیازن بچنە حکومەت یان وەکو ئۆپۆزیسیۆن دەمێننەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: ئەوە بەندە بەوەی کە چەند کورسی لە

پەرلەمانی داهاتودا بەدەستدەهێنین. ئێمە هەوڵدەدەین دەسەڵات بگرینەدەست. دەسەڵات لەلای ئێمە تەنیا خەون نییە، بەڵکو هەوڵیشی بۆ دەدەین.

**لڤین: لەم هەڵبژاردنەدا بە چ ئەنجامێکەوە بێیتە دەرەوە، خۆت بە سەرکەوتو دەزانیت؟**
نەوشیروان مستەفا: هەرشتێک میللەتەکەم هەڵیببژێرێت، من بە سەرکەوتنی دەزانم.

**لڤین: هەندێک دەڵێن ئەگەر لیستی گۆڕان لە ئاستی ئەو چاوەڕوانییەی کە هەیەتی، دەنگ نەهێنێت، ئەوکات نەوشیروان مستەفا بە ئێجگاری دەچێتەدەرەوەو کوردستان جێدەهێڵێت.**
نەوشیروان مستەفا: بۆچی دەچمەدەرەوە، هەلومەرجێکی ئاسایی هەیە. نە شەڕی ناوخۆ هەیە، نە کێشە هەیە، خەڵک چۆن بیردەکاتەوە، کەیفی خۆیەتی.

**لڤین: واتە مەیدانەکە بەجێناهێڵیت؟**
نەوشیروان مستەفا: بێگومان بەجێیناهێڵم، نەخێر.

## ٧-٦-٢٠٠٩

# كەناڵی ئەلجەزیرە

**نەوشیروان مستەفا:**

**ئێستا ئەولەویەت بۆ چاکسازییە**

سازدانی: ئەحمەد زاویتی (کەناڵی ئاسمانی ئەلجەزیرە)

بینەرانی بەڕێز سڵاوی خواتان لێبێت، لە بەرنامەی «دیداری ئەمڕۆ»ی کەناڵی ئاسمانی ئەلجەزیرە لە گەڵتانداین و میوانداری نەوشیروان مستەفا سەرۆکی لیستی «گۆڕان»مان کردوە.

**ئەلجەزیرە: ئێوە وەک رەوتێک لە سەرکردایەتی (ی.ن.ک) بەرنامەی «گۆڕان»تان لە کوردستانی عێراق راگەیاندوە، لە پشتی ئەو بەرنامەوە چیتان دەوێت؟**

نەوشیروان مستەفا: حاڵی حازر ئێمە رەوتێك نین لە ناو (ی.ن.ك)، بەڵکو رەوتێکین لە دەرەوەی (ی.ن.ك) بەرنامەی لیستی گۆڕان لەوەدا کورت دەکرێتەوە دەسەڵاتی حیزب لە دەسەڵاتی حکومەت جیا دەکرێتەوە. بەمانایەکی تر هەوڵدەدەین پەرلەمانێك دروست بکەین لە ژێر دەسەڵات و بڕیارەکانی مەکتەبی سیاسی حیزبەکانی کوردستاندا نەبێت. هەروەها بنیادنانەوەی دەسەڵاتێکی دادوەری سەربەخۆ و نەزیهی و سەربەخۆ و دادپەروەر، سنوردانان بۆ دەستێوەردانی حیزب لە زانکۆکان و ئابوری واتە جیاکردنەوەی

دەسەڵاتی حیزب لە حکومەت و بونی شەفافیەتی زیاتر لە بودجەی هەرێمی کوردستان و دادپەروەری کۆمەڵایەتی زیاتر.

**ئەلجەزیرە: بۆ پێشتر ئەو داخوازیانەتان نەبوە و ئێستا هەتانە؟**

نەوشیروان مستەفا: تەمەنی ئەزمونی کوردستان نزیکەی ١٨ ساڵ دەبێت، لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ کاری سەرەکیمان بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە بو کە لە ئەنجامی کشانەوەی ئیدارات لە لایەن حکومەتی مەرکەزیەوە هاتبوە ئاراوە، لەو هەڵبژاردنەدا دەبو دامودەزگاکانی حکومەت دروست بکرێنەوە، دەزگا دەستوری و حکومیەکان. واتە پڕکردنەوەی بۆشایی ئیداری و سیاسی و ئەمنی هەرێمی کوردستان، لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥ قۆناغەکە گۆڕا، لەو کاتەدا هەرێمی کوردستان لە روەکانی سیاسی و ئەمنی و تەنانەت ئابوریش، سەقامگیر بو.

کاری سەرەکی بریتی بو لە نوسینەوەی دەستوری عێراق، بۆیە دەبوایە خیتابی کورد خیتابێکی یەکگرتو بوایە بۆ چەسپاندنی بەشداریکردنی کورد لە دەزگاکانی دروستکردنی بڕیاری سیاسی لە عێراق. بە شێوەیەکی سەرکەوتو ئەو قۆناغەمان تێپەڕاند.

ئێستا کاری سەرەکی بریتییە لە چاکسازی لە ناوخۆدا، چاکسازی سیاسی، چاکسازی کۆمەڵایەتی، چاکسازی ئابوری و کلتوری.

**ئەلجەزیرە: هەندێک چاودێری سیاسی دەڵێن ئەم هەوڵانەی ئێوە لەوانەیە ببێتە هۆی کەرتبونی هەڵوێستی کورد لە بەغدا لە ئایندەدا؟ وەڵامی ئێوە چیە بۆیان؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پێمان وانییە یەکگرتویی کورد لە بونی یەك لیستی دایە، بەڵکو پێمان وایە یەك هەڵوێستی کورد لە بونی یەك خیتابی کورددایە. دەکرێت لەگەڵ هەمو حیزبەکانی هەرێمی کوردستاندا یەك خیتابیمان هەبێت و لەهەمان کاتیشدا ململانێ بکەین بۆ بە دەستهێنانی کورسی زیاتر لە پەرلەمانی کوردستان.

**ئەلجەزیرە: سەبارەت بە بەشداریکردنتان لە هەڵبژاردنەکانی ئایندەی پەرلەمانی لە لیستی «گۆڕان» کە سەربەخۆیە لە لیستی «کوردستانی» کە هی هەردو حیزبە کوردیەکەیە، خۆ ئامادەکردنتان بۆ ئەو هەڵبژاردنە چۆنە، بەرنامەی هەڵبژاردنتان چیە؟**

نەوشیروان مستەفا: وەك لە سەرەتادا باسم کرد بە کورتی

بەرنامەی ئێمە پێکدێت لە چەند تەوەرێکی سەرەکی. خاڵی سەرەکی بریتییە لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتی حیزب لە حکومەت. پەرلەمانێك دور لە باڵادەستی حیزبەکان. دەسەڵاتێکی تەنفیزی کارا، دەسەڵاتێکی قەزایی سەربەخۆ لە دەسەڵاتی حیزبەکان و زانکۆکان لە دەرەوەی دەسەڵاتی حیزب بن و بازاڕ و ئابوری دوربێت لە دەست تێوەردانی حیزب.

**ئەلجەزیرە: چەندین مانگە باس لەو شتانە دەکەن، کاردانەوەی شەقامی کوردی بۆ ئەو پەیامانەتان چۆن دەبینن، بە دڵنیاییەوە ئەو پەیامە لە کوردستاندا شتێکی نوێیە؟**

نەوشیروان مستەفا: کاردانەوەیەکی زۆر باشی هەبوەو خەڵك ئیستیجابەیان زۆر زۆر باش بوە بۆی، چونکە قۆناغی مەترسیمان تێپەڕاندوە و ئێستا باری سیاسی و ئەمنی و ئابوری سەقامگیرەو پەیوەندی نێوان ناوەندو هەرێم باشە و لەسەر بنەمای دەستورو تێگەیشتنی هاوبەش و دیالۆگ بونیادنراوە، بۆیە کاتی ئەوە هاتوە گرنگی بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریە سەرەکیەکانی هاوڵاتیانی کورد بدەین، بۆ نمونە دابینکردنی کارەباو ئاوی خواردنەوە و دروستکردنی قوتابخانەو نەخۆشخانەو کەمکردنەوەی جیاوازی لە نێوان بەرزترین ئاستی موچەو نزمترین ئاستی موچەی فەرمانبەرانی حکومەت.

**ئەلجەزیرە: چۆن خۆتان ئامادە دەکەن بۆ قۆناغی پاش هەڵبژاردن ئایا ئەگەر داواتان لێکرا، بەشداری لە حکومەتدا دەکەن یان وەك ئۆپۆزسیۆن دەمێننەوە؟**

نەوشیروان مستەفا: زوە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، با چاوەڕێی دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکە بین.

**ئەلجەزیرە: سەبارەت بە هاوپەیمانێتی لەگەڵ هێزە سیاسیەکان پێش و پاشی هەڵبژاردن، ئایا لە دەرموەی یەکێتی و پارتی هیچ لایەنێک داوای هاوپەیمانی لێنەکردون بۆ بەشداریکردن لەو بەرنامەیەی کە هەتانە؟**

نەوشیروان مستەفا: کەس داوای هاوپەیمانی لێمان نەکردوە، بەڵام لە هەمانکاتدا ئێمە هەوڵ دەدەین تەنسیق بکەین لەگەڵ هەمو لیستەکاندا، تەنسیق لە بواری چاودێری و ڕاگەیاندن

و سیاسەت، تەنسیق، نەك هاوپەیمانێتی. تەنسیق یان هاوپەیمانی پاش هەڵبژاردنەکان، بەستراوەتەوە بە دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکانەوە.

**ئەلجەزیرە: سەبارەت بە هەڵوێستی کورد لە بەغدا لە شەش ساڵی رابردودا، پەیوەندیەکی ئاشکرا هەبوە لە نێوان کورد بە هەردو حیزبەکەیەوە لەگەڵ بەغدا و هێشتا هەندێک گرفتی هەڵپەسێراو ماوەتەوە، ئێوە بەرنامەیەکی ئاشکراتان هەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو مەسەلە هەڵپەسێراوانە، وەک کێشەی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکان و جۆری پەیوەندیتان لە گەڵ بەغدا؟**

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ لە بەرنامەکەماندا هەیە و نامەوێ بڕۆمە وردەکاری بەرنامەکەوە، بەڵام لە روی مەبدەئیەوە پەنا بۆ دیالۆگ دەبەین نەك زمانی هەڕەشەو گورەشە. دیالۆگێك لەسەربناغەی دەستوری عێراق بونیادنرابێت.

**ئەلجەزیرە: ئێوە وەک لیستی گۆڕان یان رەوتی ریفۆرم لە کوردستانی عێراق، چۆن دەڕواننە پەیوەندی نێوان بەغدا و کوردستان، ئایا ئەو پەیوەندییە لە رێگەی دەسەڵاتی کوردیەوە دەبێت یان وەک رەوتێک ئەو پەیوەندییە دەبەستن، ئایا ئێستا پەیوەندیتان هەیە بە حکومەتی بەغداو رەوت و حیزبەکانی دیکەی عێراق؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێمە حیزب نین تاوەکو پەیوەندی دو قۆڵی و سێ قۆڵی ببەستین، بەڵام مەرجەعی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی هەمو ئەو کێشانە پەرلەمانی کوردستانەو هەروەها هەوڵدەدەین، دەزگایەکی دەستوری تایبەت بۆ لێپرسینەوە لەگەڵ نوێنەرانی کورد لە بەغداو جۆری ئەدائیان دروست بکەین، حاڵی حازر دەزگایەکی بەرپرس نییە بۆ لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو بەرپرسە کوردانەی لە بەغدان. ئێمە شەریکی حکومەتی عێراقین و لە ئۆپۆزسیۆندا نین، شەریکین لە دروستکردنی بڕیاری سیاسی و لە وەزارەتەکاندا شەریکین لە پەرلەمانی عێراقدا شەریکین، بۆیە مەبدەئی دیالۆگ باشترین مەبدەئە بۆ چارەسەرکردنی کێشە هەڵپەساوەکان

**ئەلجەزیرە: پەیوەندی لیستەکەتان یان رەوتی ریفۆرم یان نەوشیروان مستەفا وەک سیاسەتمەدارێکی ناودار لە کوردستان پەیوەندتان لەگەڵ ئەمەریکا وەک زلهێزێکی جیهانی چۆنە و کە لە عێراقدا پێگەیان**

**بەهێزە، ئایا جۆرێک لە پەیوەندیتان لەگەڵ ئەمەریکادا هەیە، یان ئایا ئەمەریکا پەیوەندی پێتانەوە کردوە بۆ دروستکردنی جۆرێک لە پەیوەندی؟**

نەوشیروان مستەفا: پەیوەندی سیاسی دیبلۆماسی لە ئەستۆی حکومەتی عێراقدایەو لەسەر شانی حکومەتی فیدراڵە کاروباری سیاسەتی دەرەوە لە ئەستۆ بگرێت، بۆیە پەیوەندیی لەگەڵ ئەمەریکا لە کارە سەرەکییەکانی حکومەتی عێراقە، ئەوە لەلایەك، لە لایەکی دیکەوە ٢٠ ساڵ زیاترە بزوتنەوەی کوردی جۆرێك لە پەیوەندی لەگەل ئیدارەی ئەمەریکادا هەیە. بە تایبەتی پاش کۆڕەوەکە و هێرشکردنی سوپای عێراق بۆ سەر کوردو دروستکردنی «ناوچەی ئارام»، لەو کاتەوە تاوەکو ئێستا پەیوەندی هەیە لە نێوان سەرکردایەتی کوردو بەرپرسەکانی ئەمەریکا. ئەمەریکییەکان بەرژەوەندییان هەیە لە ناوچەکەدا، بەرژەوەندییان هەیە لە دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ گەلانی ناوچەکەدا. بەرژەوەندییان هەیە لە سەقامگیری سیاسی لە ناوچەکەو رێگە نەدان بە هاتنی تیرۆریستان بۆ ناوچەکە. پەیوەندییەکان لەسەر ئەو بنەمایانەن و پێموانییە پەیوەندییەك هەبێت لە دەرەوەی حکومەتی عێراقی.

**ئەلجەزیرە: ئێران ئێستا رۆڵێکی گەورەی هەیە لە عێراقدا. بەپێی قسەی چاودێران ئێران بە شێوەی جۆراوجۆر بونی لە عێراقدا هەیە، پەیوەندی ئاشکرای هەیە لەگەڵ حکومەتی هەرێم و هەردو حیزبەکەو هێزە عێراقییەکانی دیکەدا لە باشورو ناوەڕاستی عێراق، بەو پێیەی شاری سلێمانی هاوسنورە لەگەڵ ئێران، ئایا ئێران هەوڵی نەداوە پەیوەندیتان پێوە بکات و جۆرێک پەیوەندیتان لەگەڵ دروست بکات؟.**

نەوشیروان مستەفا: ئێران وڵاتێکی گرنگەو هێزێکی گەورەی ناوچەکەیە. عێراق زیاتر لە هەزار کیلۆمەتر سنوری هاوبەشی لەگەڵدا هەیە. نەك هەر سنوری هاوبەش، بەڵکو پەیوەندی مەزهەبی و نەتەوەیی و کلتوری و ئابوری لەگەڵ هەردولادا هەیە، بۆیە گرنگە پەیوەندییەکی هاوسەنگ هەبێت، چی لە لایەن حکومەتی مەرکەزی چی لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان زیاتر لە ٦٠٠ کیلۆمەتر سنوری هاوبەشی هەیە لەگەڵ ئێران، بۆیە پێویستە پەیوەندیمان لەگەڵ ئێراندا باش بێت و لەسەر بەرژەوەندی هاوبەش و پەیوەندی حکومەتی مەرکەزی و حکومەتی هەرێم لەگەڵ ئێران باشەو کۆنسوڵی ئێران لە سلێمانی و هەولێر هەیە و مەرکەزی بازرگانی و کۆمپانیای ئێرانی لە کوردستاندا بە

ئازادی کار دەکەن.

**ئەلجەزیرە: بەڵام وەک رەوتێک، پەیوەندیتان لەگەڵ ئێراندا هەیە؟**
نەوشیروان: نەخێر

**ئەلجەزیرە: وەک سیاسەتمەدارێکی ناوداری کورد چۆن پەیوەندی کوردو ئێران لەلایەک و کوردو تورکیا لەلایەکی تر هەڵدەسەنگێنن؟**
نەوشیروان مستەفا: ئەوە بابەتێکی زۆر ئاڵۆز، چونکە گەلی کورد بەسەر چەند وڵاتێکی وەك ئێران و تورکیاو عێراقدا دابەشکراوە. لەودیو سنورەکانەوە پەیوەندی نەتەوەیی هەیە لە نێوان کوردەکاندا، لە هەمانکاتدا کێشە هەیە لە نێوان هەرێمی کوردستان و وڵاتانی دراوسێ بە تایبەتی تورکیا ئەویش بەهۆی بونی هێزی چەکدار لەسەر سنورەکان، لەبەر بەربڵاوی سنورەکەش، حکومەتی هەرێم ناتوانێت کۆنترۆڵی هەمو ناوچەکە بکات، کێشەی کوردەکانی تورکیا، کێشەی تورکیایە و کێشەی عێراق نییە. ناتوانرێت لە رێگەی هێزی چەکداری کوردی عێراقەوە کێشەی کوردی تورکیا لە ناو ببرێت، بەڵکو دەکرێت کێشەکە سیاسیانە چارەسەر بکرێت کێشەکە لە خاکی عێراق چارەسەر ناکرێت چارەسەرەکەی لە خاکی تورکیایە.

**ئەلجەزیرە: باستان لە کێشەی کورد کرد لە تورکیاو ئێران، کێشەی کورد لە عێراق لە رێگەی فیدراڵیەتەوە چارەسەرکراو پرۆژەی دیکە هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئایا فیدراڵیەت چارەسەری کێشەکە دەکات، یان ئێوە پرۆژەی ترتان هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراق؟**
نەوشیروان مستەفا: لەم قۆناغەدا چارەسەری فیدراڵی چارەسەرێکی زۆر چاکە بۆ کێشەی کورد لە عێراق، مانەوەی کورد لە ناو عێراقدا، هێزە بۆ کورد، نەك لاوازی. بۆیە من لایەنگری فیدراڵیم و لە نوسینەوەی دەستوری عێراقدا لە بەغدا بوم و بەشداریم کرد لە نوسینەوەی دەستوری عێراقی و پەیوەندی فیدراڵی لە نێوان بەغداو حکومەتی هەرێم.

**ئەلجەزیرە: سیاسەتمەدارانی کورد بەردەوام باس لە مانەوەیان لە چوارچێوەی عێراقدا دەکەن، هەندێ لایەنی عەرەبی پێیان وایە**

**ئەو هەڵوێستە لە ئایندەدا گۆڕانی بەسەردا دێت و ئەو هەڵوێستە هەڵوێستێکی تاکتیکییە و لەوانەیە لە ئایندەدا بگۆڕێت؟.**

نەوشیروان مستەفا: لە ئایندەیەکی نزیکدا پێموایە لە چوارچێوەی عێراقدا دەمێنێتەوە، بەڵام ناتوانم پێشبینی ئایندە بکەم، چونکە پێش ۲۰ ساڵ ئەوروپا شێوەیەکی دیکەی بو ۲۰ ساڵ دوای ئەوەش شێوەیەکی دیکەی هەیە. هەروەها بە نسبەت رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشەوە وایە. من ناتوانم پێش بینی ئەوە بکەم ۲۰ ساڵی دیکە چی رودەدات.

**ئەلجەزیرە: لە شەقامی کوردستاندا ترس لەوە هەیە پەیوەندی ئێوەو سەرکردایەتی یەکێتی بگاتە ئاستی شەڕی سارد و نهێنیەکانی رابردو ئاشکرا بکرێت؟**

نەوشیروان مستەفا: من لەگەڵ ئەوەدام لاپەڕەکانی رابردو دابخرێت، وەك دەزانن شەڕی ناوخۆ هەبوە لە کوردستانداو دواتر ئاشت بونەوە رویدا لە نێوان هەمو لایەنەکاندا. من لەگەڵ ئاشت بونەوە و هەڵنەدانەوەی لاپەڕەکانی رابردوم، و نامەوێت بچینە ناو پێچ و لۆکانی مێژووەوە تا ئەو رادەیە نەبێت کە خزمەتی ئایندە بکات، بەڵام گەر بگەڕێینەوە بۆ دواوە، ترسمان لە باسکردنی رووداوەکان نییە. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە هیوادارم کار نەگاتە هیچ جۆرە ئاڵۆزیەکی سیاسی و ناسیاسی لە کوردستانی عێراقدا. چونکە لای خۆمانەوە، هێزی چەکدار و سەربازیمان نییەو مەسەلەی ئەمنی سیاسی و پاراستنی هەڵبژاردنەکان لە ئەرکە سەرەکییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانەو دەکرێت لەم بارودۆخەدا لە رێگەی یاساوە رێگە بگرن لە هەمو جۆرە گرژی و ئاڵۆزییەك.

**ئەلجەزیرە: ئایا مەترسی ئەوەتان نییە ئەم دۆخەی ئێستا لە چوارچێوەی کرژی راگەیاندن دەرچێت و بگاتە ئاستی روبەڕوبونەوەی چەکداری لە نێوان ئێوە و دەسەڵاتی کوردی یان (ی.ن.ك)؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێمە بزوتنەوەیەکی سیاسین و هێزی چەکدارمان نییە، ئێمە پەنا بۆ دادگا و یاسا دەبەین، ئەگەر لە سلێمانی رێگەمان پێ نەدەن، پەنا بۆ دادگای فیدراڵی دەبەین لە بەغدا یان رێکخراوە نێونەتەوەییەکان، ئێمە پەنا بۆ چەك نابەین.

**ئەلجەزیرە: لە میدیا لۆکاڵیەکان باس لە گوشار دەکرێت بۆ سەر کادرو لایەنگرەکانتان، ئایا هەڵوێستان وەرنەگرتوە لەو گوشارانە بە رێگەی دادگا بۆ نەهێشتنی ئەو گوشارانە لەسەر کادرەکانتان؟**

نەوشیروان مستەفا: ئێمە ئەوە بە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و مافی هاوڵاتیبون دەزانین و ئەرکی حکومەت دۆزینەوەی کارو موچەیە بۆ هاوڵاتیان، لە رێگەی دادگاوە بەرگری لە هاورێکانمان دەکەین.

**ئەلجەزیرە: دوایین پرسیارمان ئەوەیە، ئێستا پەیوەندیتان لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا چۆنە؟ ئێوە کەسی یەکەم و دوەم بون لە ناو (ی.ن.ک)دا؟.**

نەوشیروان مستەفا: لەسەر ئاستی شەخصی پەیوەندیمان ئاساییە.

**الجزیرە: بەرێز نەوشیروان مستەفا سەرۆکی لیستی گۆڕان، سوپاستان دەکەین بۆ رەخساندنی ئەو دەرفەتە.**